# ڕێبازە ئەدەبییەکان

**کلاسیزم رۆمانسیزم ڕیالیزم پەرناس**

**سمبوولیزم دادابیزم سوریالیزم**

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە

**د. فەرهاد پیربال**

ناوی کتێب: ڕێبازە ئەدەبییەکان
ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: د. فەرهاد پیرباڵ
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٠٨
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: هەندرێن شێرزاد
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالیق
سەرپەرشتیاری چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٤٢)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

**پێشکەشە**

بە قوتابییان و خوێندکاران و فێرخوازان،

ئەوانەی ئەم کتێبە دەکەنە هەنجەتێک بۆئەوەی لەژێر درەختەکان،

لە پەنا دیوارەکان،

لەناو سەنتەرەکان،

لەناو یانەکاندا..

قسە لەبارەی خۆشەویستی و خۆپێشاندان و شووتی و مامۆستای خراپ و سۆبە و دوارۆژی وڵاتەوە دەکەن...

# دەسپێک

ئەم کتێبە، پیشاندانێکی پانۆرامایی هەندێ لە ڕێبازە ئەدەبی- هونەرییەکانی ئەورووپایە: بارودۆخی سەرهەڵدانیان، سەرچاوە فەلسەفییەکانیان، یاسا و ڕێساکانیان. بەرگی دووەم بریتی دەبێت لە فوتووریزم و کووبیزم و ناماقووڵ و ئەبستراکت و بێهوودەیی و لێتریزم و کۆبرا و ئەوانی تر.

هیوادارم ئەم پەڕتووکە ببێتە سەرچاوەیەکی دیکە بۆ ئەو پۆلانەی کە دەرسی «ڕێبازە ئەدەبییەکان» لە زانکۆ و ئەکادیمیا و پەیمانگە هونەرییەکاندا دەخوێنن.

دانی پێدا دەنێم: بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە، مێتۆدێکی ئەکادیمیم پەیڕەو نەکردووە، چاوم لەوە نەبوو بیکەمە تۆژینەوەیەک و تەرقیەی پێ بکەم، تەنیا ئەوەندەم ویستووە خوێنەر بتوانێت بەزمانێکی ئاسانکراو و سادە چەند زانیارییەکی پانۆرامایی و بنچینەیی لەبارەی گەوهەری ئەو قوتابخانە ئەدەبی- هونەرییانەوە تێ بگات و چیتر تەنیا و تەنیا پشت بەو ڕستە کۆن و قسە سارد و سڕانە نەبەستێت کە لەناو هۆڵی موحازەڕاتدا، هەر ڕۆژەی لاپەڕەیەکی پێ دەنووسرێتەوە.

بۆ ئەو سەرچاوانەی بەکارم هێناون، گرفتم نەبوو: زیاتر پشتم بە سەرچاوە تیۆری و ئەکادیمییە فەرەنسییەکان بەستووە. جگە لەمەش زۆربەی بەرهەمی نووسەرە کلاسیک و ڕۆمانسی و ریالیستەکان کە لە توێی باسەکاندا ناویان هاتووە، نوسخە فەرەنسییە ئۆریژیناڵەکانیان تەماشاکراون.

# زاراوەی «ڕێباز» و ڕێبازە ئەدەبییەکان

وشەی «ڕێباز» لە کوردیدا گەلێک جاران پێیشی دەڵێن «قوتابخانە»، لە «مدرسە» و «مذهب»ی عەرەبی وەرگیراوە، لە زمانی فارسیشدا پێی دەڵێن «مکتب» کە هەمووشیان لە ئێکۆل Ecole ی لاتینی و فەرەنسییەوە وەرگیراون.

ئێکۆل Ecole لە قامووسی لارووسی زمانی فەرەنسیدا لە لاپەڕە ٤٦٧دا واتە: «سەرجەم ئەو لایەنگیرانەی کە سەر بە یەک کۆمەڵە بنەمای فەلسەفی یا ئەدەبی یا هونەرین؛ یان کۆمەڵە بنەمایەکی فیکریی فەیلەسووفێک یان هی هونەرمەند و نووسەرێک؛ هەروەها واتە: هەموو ئەو نووسەر یان هونەرمەندانەی کە خاوەن یەک جۆر تێگەیشتنی جوانیناسین».

ئەم پێناسەیە، کەواتە، نزیک دەکەوێتەوە لە چەند بنەمایەکی ئێستەتیکی و بیریی هاوبەش کە پێکەوە لەسەری ڕێککەوتبن و پیادەی بکەن. هەر بۆیەش لە زمانی ئینگلیزیدا زۆر جاران پێی دەگوترێ «Doctrine» واتە چەند بنەمایەک کە لەسەری بڕۆین و پیادەی بکەین.

ڕێباز لە بواری ئەدەبیاتدا بریتییە لە کۆمەڵە تیۆر و بۆچوونێکی ئەدەبی و هونەری کە لە شارێک، لە وڵاتێکدا سەرهەڵدەدات، نوێنەرەکانیشی بە بەرهەمەکانیان دەیچەسپێنن. زۆربەی جاران وەک چەند بنەمایەک دووبارە دەبێتەوە و سنووری ئەو وڵاتە دەشکێنێ و بەناو وڵاتانی دیکەدا بڵاودەبێتەوە.

تۆژینەوە لە هەر ڕێبازێکی ئەدەبی یان هونەری دەچێتە خانەی تۆژینەوە لە فەلسەفەی جوانیناسییەوە Esthetique، یان هیچ نەبێت پەلکێشی ئەوێمان دەکات. بۆیە، تۆژینەوە لە بنەما و خاسیەتەکانی هەر یەکێک لەو ڕێبازانە، واتە تۆژینەوە لە ئێستاتیکا.

کێ ئەم ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییە جۆراوجۆرانەی - بۆ یەکەمین جار- لە یەکتری جودا کردەوە و ناوی لێ نان و پۆلێنی کردن؟ کەی بوو؟ بۆچی؟

یەکەمین جار تۆژەرە ڕۆژئاواییەکان، واتە ئەدەبناس و هونەرناسە ئەورووپاییەکان بوون کە هاتن ئەو ڕێبازە ئەدەبی و ئەو قوتابخانە هونەریانەیان - هەر یەکەیان بەپێی بنەما فەلسەفی و فیکرییەکانیان و خاسیەتە تایبەتییەکانی خۆیان - لە یەکتر جودا کردەوە و پۆلێنیان کردن. ئەمە جگە لەوەی، بەشێکی زۆر لەو ڕێبازانە، هەر لەلایەن خودی دامەزرێنە ئەورووپاییەکانیانەوە ناویان لێ دەنرا، تەنانەت بنەما ئێستەتیکی و خاسیەتەکانیشیان دادەڕێژران.

ئەوەش لەبیر نەکەین کە خودی ئەورووپاییەکان، بەشێوەیەکی گشتی ڕۆژئاواییەکان بوون (گریک و ڕۆمانییەکان، پاشانیش بەتایبەتی فەرەنسی و ئینگلیز و ئەڵمان) کە بنەما و دەستوور و خاسیەتەکانی ئەو ڕێبازانەیان دادەمەزراند.

کەواتە، قوتابخانە ئەدەبی و ڕێبازە هونەرییەکان، لەلایەن خودی ئەورووپاییەکانەوە دروست کراون و لە خودی ئەورووپادا سەریان هەڵداوە.. هەر لەلایەن خودی خۆشیانەوە پۆلێن کراون و لێیان کۆڵدراوەتەوە. گومان لەمەدا نامێنێ ئیتر کە هەموو ئەم ڕێباز و قوتابخانە ئەدەبی و هونەرییانە لە سەدا سەد ئەورووپایین، تەنانەت مێتۆدی پۆلێنکردن و فەلسەفەی تۆژینەوەکانیش لێیان، ئەورووپین و لەسەر بنەمای بیرکردنەوەیەکی ئەورووپایی دامەزراون.

بەم شێوەیە، هەمـوو ڕێبازە ئەدەبی و قـوتابخانە هونەرییەکان – بە لای کەمییەوە ئەوانەی لە تۆژینەوە ئەکادیمی و زانکۆییەکاندا دەیانخوێنین – بەرهەمی چێژ و بیر و کۆمەڵگەی ئەورووپان، کە پاشان – بەتایبەتی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە– دارژانە ناو ئەدەبیات و پۆلێنبەندی و تۆژینەوەکانی گەلانی ڕۆژهەڵاتەوە: هەر نەتەوەیەکی ڕۆژهەڵات – بەتایبەتی لە سەرەتادا تورک و عەرەب، ئنجا فارس و کورد – هاتن لاسایی ئەو ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییانەی ئەوانیان کردەوە، یانیش هاتن کەرەستە و بەرهەمە هونەری و ئەدەبییەکانی مێژووی خۆیان، بەپێی مێتۆد و پۆلێنکردنە ئەورووپییەکانەوە لە یەکتری جودا کردەوە.

تۆژەر و ئەدەبناسە عەرەبەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم، پێش هەمـوو نەتەوەیەکی دیکەی ڕۆژهەڵات هاتن ماتێریاڵە ئەدەبی و کەرەستە هونەرییەکانی مێژووی عەرەبیان بەشێوەیەکی ئەوتۆ شیتەڵ کردەوە کە چۆن لەناو ئەو ڕێبازە ئەورووپاییانەدا جێگەیان بۆ بکەنەوە. ئەو ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییانەی ئەورووپایان کردە کراسێک و کردیانە بەر کولتووری خۆیان. نووسەر و تۆژەرە عەرەبە پێشڕەوەکان کە دامەزرێن و ڕێبەری ڕۆشنبیریی نوێی دنیای عەرەب بوون، بۆ نموونە، تەها حوسێن، لە کتێبی (مستقبل الثقافة في مصر) هەروەها سەلامە موسا و زۆری دیکەش، پێیان وابوو کە پێویستە عەرەب هەمـوو پۆلێنکردن و بنەمایەکی ئێستاتیکیی خۆیان لە ئەورووپاوە وەربگرن.

ئەم دەسپێشخەرییەی ئەورووپا بۆ پۆلێنکردنی ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییەکان واتای ئەوە ناگەیەنێ کە گەلانی ڕۆژهەڵات ئەدەبیات و هونەریان – لە سەدەکانی سەردەمی گریک و ڕۆماندا یان لە سەدەکانی پێش سەدەی بیستەمدا – نەبووە، بەڵام هێندە هەیە کە ئەورووپا (لە سایەی پێشکەوتنە فیکری و زانستییەکانی سەردەمی ڕێنسانس لە سەدەکانی ١٦ و ١٧ هەروەها لە سەدەی ڕۆشنگەریدا لە سەدەی ١٨م) توانی بۆ خۆی دەسپێشخەر بێت بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە و تەنزیرات لە بارەی مێژووی ئەو ئەدەبیات و هونەرە بێنێتە ئارا: گەلانی ڕۆژهەڵات نەپرژانە سەر ئەوەی کە خۆیان بتوانن دەسپێشخەری بکەن، پۆلێنکردن و تەنزیراتی خۆیان بەشێوەیەکی جوداواز – بەپێی خاسیەت و قۆناغەکانی پێشکەوتنی ئەدەبیات و هونەری خۆیان – دابڕێژن.

ئەم دەسپێشخەرییەی ئەورووپا و ئەم لەدوواماندەی جیهانی ڕۆژهەڵات، سەبارەت بە کۆمەڵێک هۆکار بوون کە هەمـوویان دواکەوتوویی جیهانی ڕۆژهەڵات و ئیسلامەتی دەسەلمێنن: بۆ نموونە گەلانی ڕۆژهەڵات، تەنانەت تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش، هیچ ئێستاتیکا و تێگەیشتنێکی هاوچەرخانەی ئەوتۆیان بۆ ئەدەب و هونەر و داهێنان نەبووە کە بتوانێ مێژووی ئەدەبیات و هونەر و ڕێبازەکان پۆلێن بکات. ئەگەر چەند هەوڵدانێک، بۆ نموونە بەم دواییە لە لای مەحمود سامی ئەلبارودی، د. نەجیب گەیلانی، مستەفا سادق ئەلرافعی، محەمەد ئیقبال.. هەشبووبێت، ئەوا ناکامڵ و کەموکورت، سادە و ڕووکەش، یان ناکۆک و ناتەبا، یانیش یەکلابین بوونە، تەنیا لەسەر بنچینەی ئایدیۆلۆژیەت و سیاسەتبازی و بەرژەوەندییەکانی ئیسلامی سیاسی دامەزراون: نەگەیشتوونەتە ئاستی فەلسەفەی جوانیناسی و پۆلێنکردنێکی دروستی تازەی ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییەکان.

ئەمڕۆ، تەنانەت ئەو نووسەرە ناوبراوانە خۆشیان ناتوانن نکۆڵی لەمە بکەن کە ئەورووپاییەکان لە بواری فەلسەفە و شارستانییەت و ئێستاتیکاوە لە ئێمە پێشکەوتووتر و بەهێزترن. هەر بۆیەش توانیویانە چەمکە ئێستاتیکی و پۆلێنکردنە ئێستاتیکییەکانیان، هەروەها ئەو مێتۆدە باوەی پۆلێنکردنی ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییەکان، بەسەر خۆیان و دنیای ئێمەشدا فەرز بکەن.

ئەو بزووتنەوە فراوانە کولتووری و زانستی و شارستانییەی لە ماوەی سەدەکانی ١٥ تا ١٦ بە ناوی ڕێنسانس

Renaisance له ئەورووپا سـەری هەڵدا وای کـرد هەر نـەتەوەیەکی ئەورووپا -بەتایبــەتی ئیـتــالیـا و فـەرەنسـا و ئینگلتەرە و ئەڵمانیا - کولتووری تایبەتی نەتەوەیی خۆی دروست بکات و ببێتە خاوەن ئەدەبی نەتەوەیی خۆی و ڕێبازی تایبـەتی ژیانی خۆی بگرێتە بەر. لە هەمان کاتدا ڕێنسانس ڕێگای خۆشکرد بۆ پەرەسەندنی چێژ و بیری ئەورووپایی بۆئەوەی بتــوانن دەســتنووسی کــۆن کــۆبکەنەوە و ئەدەبیــاتی هەمــوو دنیــا -بەوانەی گـریک و ڕۆمانییەکانیشەوە- لەبەر دەستیاندا بێت و پاشانیش بتوانن بە عەقڵیەتێکی تازەوە لێکۆڵینەوەی ئێستاتیکیی جۆراوجۆر ئەنجام بدەن.

جگە لەمەش، بەرەوپێشـەوەچوونی بازرگانی لە ئەورووپا و دۆزینەوە جوگرافییـەکان و ناسینی وڵاتان، لەمانەش گرنگتر داهێنانی چاپخانە (گۆتێنبێرگ لە ساڵی ١٤٤٥ لە ئەڵمانیا) و بەرەوپێشـەوەچوونی چاپخانە و داهێنانی چاپکردنی نوێ و توانای بڵاوکردنەوەی بەرهەم و کـولتـوور و نووسـراوەکـانیـان بە دنیـادا، وایکرد کـە کـولتـووری ئەورووپایی و تێگەیشتنەکانیان زووتر و بەشێوەیەکی ئاسانتر خۆی فەرزبکاتە سەر گەلانی دنیا، - لەناو ئەمانەدا ئەدەبیات و هونەر و بیری ئێستاتیکیشیان.

نووسەرانی سەردەمی ڕێنسانس ڕێگەیان بۆ سەرهەڵدانی پۆلێنکردنی ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییـەکان خۆش کرد: ڕەخنەگری ناوداری فـەرەنسی، نیکۆڵا بوالۆ Nicolas Boileau (١٦٣٦- ١٧١١) لە سـاڵی ١٦٧٤دا کـتـێبـە ناودارەکەی خۆی (هونەری شیعر Art Poethique)ی بڵاوکردەوە و دەستوور و بنەماکانی کلاسیزمی بەشێوەیەکی تیۆری تێدا شی کردەوە و چەسپاند.

بە هەمان شێوە، لەدوای ڕێنسانس، سەدەی ڕۆشنگەری، بە ئینگلیزی Enlightenment، بە فەرەنسی L age des lumieres بزاڤێکی هزری بوو کە لە کۆتایی سەدەی ١٧ دەستی پێکرد و بە درێژایی سەدەی ١٨ ئەورووپای هەژاند، هەمـان ڕۆڵی کـاریگەری بینی لە بـواری پەرەسـەندنی چەمکە ئێسـتـەتیکییـە ڕۆژئاواییـیـەکـان و بڵاوکـردنەوەی تێگەیشتنە فەلسەفییە ئەورووپاییەکان لە بارەی ئەدەبیات و هونەر و پۆلێنکردنی ڕێبازەکان.

بەم شێوەیە، دەرکەوت کە بیرۆکەی پۆلێنکردنی ڕێبازە ئەدەبی و هونەرییەکان و تەنانەت سەرهەڵدانی خـودی ڕێبازەکانی دیکە خۆشیـان -ئەوانەی لەدوای کلاسیزمەوە هاتوون: ڕۆمانسیزم، پەرناس، ریالیزم، سمبوولیزم- پرۆسەیەکی تازەیە، لەدوای سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە دەرکەوتن و بیریان لێ کرایەوە.

شایانی باسە، زۆربەی ڕێبازەکان (ریالیزم، پەرناس، سمبوولیزم، سوریالیزم) لە فەرەنسا سەریان هەڵدا و دواتر بە وڵاتانی دیکەی ئەورووپادا بڵاوبوونەوە. ئەمە لەکاتێکدا ڕۆمانسیزم لە سەرەتادا لە ئینگلستان، بەڵام ڕێبازێکی وەک دەربڕینخوازی لە سەرەتادا لە ئەڵمانیا بڵاوبووەتەوە.

کەواتە، سەرهەڵدانی هەر ڕێبازێکی ئەدەبی یان هونەری پابەند بووە بە بارودۆخی گشتیی کۆمەڵگەکەوە. هەر بۆیەش هەندێ ڕێباز لە هەندێ وڵاتدا لاوازترن یان بەهێزترن، یان دەبینین هەندێ جار ڕێبازێک تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم لە وڵاتێکدا دەوام دەکات و ڕێبازێکی دیکە جێی پێ دەگرێتەوە.

بۆیەش دەبینین سـەردەمی دەرکەوتنی ڕێبـازە ئەدەبی و هونەرییـەکـان لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا مـەرج نییـە لەگەڵ سەردەمی دەرکەوتنیان لە ئەورووپادا پێکەڵپێک ببێتەوە. کرۆنیکی یەک لەدوای یەکتر هاتنی ئەم ڕێبازانە لە ئەورووپا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

کلاسیزم لە سەدەکانی پ.ز تا کۆتایی سەدەی ١٨م

رۆمانسیزم له ۱۷۹۷ بەملاوە

پەرناس له ۱۸۷٦ بەملاوە

ریالیزم له ۱۸٤۳ بەملاوە

سمبوولیزم له ۱۸۸٦ بەملاوە

فوتووریزم له ۱۹۰٦ بەملاوە

دادایزم له ۱۹۱٦ بەملاوە

سوریالیزم له ۱۹۱۹ بەملاوە

ئەمە لە کاتێکدا دەشێ لای هەندێ میللەتانی رۆژهەڵات، بۆ نموونە رۆمانسیزمی کوردی، لە سەردەمی کلاسیزمی ئەوروپیدا دەرکەوتبێت.. یان ریالیزمی عەرەبی لە سەردەمی سوریالیزمی ئەورووپیدا دەرکەوتبێت. مەرجیش نییە ناوەرۆک یا شێوازی ئەو رێبازانە لە هەموو وڵاتێکدا لە یەکتر بچن و وەک یەکتر وابن.

## رێباز بە یەکێک لەم شێوانەی خوارەوە لەدایک دەبێ:

۱- لە رێگای کۆمەڵێک نووسەری جیاجیاوە بەشێوەیەکی بێ بەرنامە و پەرت و بڵاو، لە وڵاتێک یان لە چەند وڵاتێکدا پێکەوە و لە ماوەیەکی درێژدا؛ بۆ نموونە: کلاسیزم.

۲- لەسەر دەستی تەنیا یەک نووسەردا، بۆ نموونە: ناتوورالیزم کە ئێمیل زۆلای فەرەنسی لە پاریس بڵاوی کردەوە.

۳- لە رێگای کۆبوونەوەی کۆمەڵێک نووسەر و هونەرمەند و رووناکبیرەوە و بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەک، یان بڵاوکردنەوەی گۆڤارێک و چەند گۆڤارێک، بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو، لە شارێکی دیاریکراودا کە پاشان بە وڵاتانی دیکەدا بڵاودەبێتەوە؛ بۆ نموونە: ریالیزم، دادایزم و سوریالیزم.

بڵاوبوونەوەی هەر رێبازێکی ئەدەبی یان هونەری، بێگومان لە رێگەی کەناڵی جۆراوجۆرەوە دەبێت. یەکێک لەم کەناڵانە تەرجەمەیە، کە بێگومان ئەگەر بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو بێت کاریگەرتریش دەبێت. هەندێ جاریش نووسەرانی نەتەوەیەک ڕاستەوخۆ لەناو بزاڤی کولتووریی نەتەوەی دووەمدا دەژین و ڕاستەوخۆ دەکەونە ژێر ئەرک و پێویستیی گواستنەوەی ئەو رێبازە تازەیەی نەتەوەی دووەم بۆ ناو کولتووری خۆیان. هەندێ جاریش ئامرازەکانی ڕاگەیاندن رۆڵی مەزن دەبینێ لە بڵاوکردنەوەی رێبازێکی ئەدەبیدا بەناو میللەتانی دنیادا، بەتایبەتی ئەگەر ئایدیۆلۆژیەتێک - بۆ نموونە لە کاتی بڵاوکردنەوەی رێبازی ریالیزمی سۆشیالیستیدا - لە پشت ئەو ڕاگەیاندنەدا بێت.

# کلاسیزم

لەبارەی ڕەچەڵەکی زاراوەی کلاسیزم چەندین بۆچوونی جۆراوجۆر هەن:

١- لە کلاسیکۆس Classicus ەوە هاتووە، کە بە واتی چین دێت.

٢- لە وشەی Classise لاتینییەوە هاتووە کە بە واتای پارچەیەکی کەشتی دێت.

واتای زاراوەی کلاسیزم قۆناغ لە دوای قۆناغ پەرەی سەندووە و واتای تازەی پەیدا کردووە، لەوانە:

١- لە زمانی هاوچەرخی ئینگلیزی و فەرەنسیدا Classe بە واتای پۆل بەکاردێت.

٢- لە سەدەی بووژانەوە (ڕێنسانس)دا و بەتایبەت لە لایەن هوومانیستەکانەوە کلاسیک بە شاکارە ڕۆمانی و یۆنانییەکان دەگوترا.

٣- ئەو ئەدەب و هونەرە دەگرێتەوە کە لە سەدەی حەڤدەمدا باو بوو.

٤- لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا کلاسیک بەو ئەدەبیات و هونەرە بەرزە دەگوترا کە شایانی شوێن پێ هەڵگرتن و لاساییکردنەوە بوو. گۆتەی شاعیری ئەڵمانی بە ئەدەبی باشی دەگوت "کلاسیک" بە ئەدەبی خراپیشی دەگوت"ڕۆمانتیک".

٥- ئەو بەرهەمانە دەگرێتەوە کە لەسەر ڕێساکانی نووسەرانی گریک (ئەسکیلۆس و ئۆریپید و سۆفۆکلیس و ئەرستۆ) دەڕۆیشتن.

٦- ئەمڕۆش کلاسیک بە هەموو ئەو بەرهەمانە دەگوترێ کە پەسەند و ڕەسەن و دانسقەن، هەروەها بەو بەرهەمانە دەگوترێ کە پێش ڕۆمانسیزم سەریان هەڵداوە.

یەکەم جار نووسەری ڕۆمانی ئۆلیژیلیۆس Au-liscellius بوو، کە لە سەدەی ٢ی زاییندا، لە کتێبی



پەیکەرێکی سەردەمی **بارۆک**

(شەوانی ئەتیکا) ئەم زاراوەیەی بەکارهێنا. ئەمەش لە دوو شوێنی جیادا:

١- Scriptor Classicus

واتە: نووسراوی چینی سەرەوە

٢- Proletarius Scriptor واتە: نووســـــراوی چینی پرۆلیتاریا

ئەم دوو شـــێـــوە بەكـــارهێنانە، خـــۆی لە خـــۆیدا سیفەتێکی چینایەتیی دایە ئەدەب: ئەدەبی کلاسیکی دایە پاڵ چینی سەرەوەی کۆمەڵ.



کلاسیزمی سەردەمی **بارۆک**

## سەرچاوەکانی کلاسیزم

دەستوور و بنەماکانی کلاسیزم لە چەندین سەرچاوەی ئێســتــەتیکیــیــەوە، کــە زۆربەیان ســەرچاوەی یۆنانیی کۆنن، هەڵێنجراون:

١- هونەری شیعر Poetica نووسینی ئەرستۆ (٣٢٢ - ٣٨٤ پ. ز).

٢- هونەری شیعر، نووسراوی هۆراس Horace (٦٥- ٦٨ پ. ز).

ئەرستۆ و هۆراس لەم دوو شاکارەی خۆیاندا بنەما و دەستوورەکانی کلاسیزمیان داڕشتبوو. ئیتالییەکان لە سەدەی ١٥ و ١٦مدا چەندین جار ئەم دوو شاکارەیان لە یۆنانییەوە تەرجەمە کردە سەر زمانی ئیتالی، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بنەماکانی کلاسیزم.

لە هەمان کاتدا، نووسەرانی مەزنی گریک و ڕۆمان (پێش لەدایکبـــوونی مـــەســـیح) وەک: ئەسکیلۆس، ئۆریپید، هۆمیرۆس.. سەرچاوەیەکی دیکەی کلاسیزمی ئەورووپی بوون کـــە لە لایەن نووســـەرانی ئەورووپای سەردەمی ڕێنسـانسـەوە، تەنانەت هەر لە پێشـتـریشـەوە لاســاییــان دەکــرایەوە. تەنانەت هەندێ ڕەخنەگــر وای دەبینن کە ئەدەبیاتی سەردەمی گریک (سەردەمی یۆنان و ڕۆمـانی دێرین) بە کـلاسـیـزمی کـۆن دادەنرێت، ئەو

کلاسیکەی دواتری ئەورووپاش کلاسیزمی نوێیە.

٣ - بەرهەمەکانی نووسەرانی سەردەمی ڕێنسانس Rennaissance لە ماوەی سەدەی ١٥م و ١٦مدا، هەروەها بەرهەمی نووسەرانی بزووتنەوەی ڕۆشنگەری Enlightenment لە کۆتایی سەدەی ١٧ تا کۆتایی سەدەی ١٨م، بوونە چەند سەرچاوەگەلێکی دیکەی کلاسیزم. بەتایبەتیش کاتێ لە ساڵی ١٦٧٤دا ڕەخنەگری فەرەنسی، نیکۆلا بوالۆ (١٦٣٦ - ١٧١١) کتێبە گرنگەکەی خۆی(هونەری شیعر Art Poethique )ی بڵاوکردەوە و دەستوور و بنەماکانی کلاسیزمی تێدا شی کردەوە و چەسپاندنی؛ توانی گیانێکی هاوچەرخانە بە ڕێبازەکە بدات و کتێبەکەی وەک سەرچاوەیەکی تیۆریی گرنگی کلاسیزم پێشکەش بکات.



پەیکەرێکی سەردەمی **کلاسیزم**

### ١- ئەرستۆ

هەرچەند ئەفلاتوون پێش ئەرستۆ باسی ئەدەبیات و هونەری کردووە، بەڵام کتێبی «هونەری شیعر Poet-ica»ی ئەرستۆ بە گرنگترین و یەکەمین سەرچاوەی کۆنی تیۆری دادەنرێت لە بواری داهێنانی ئەدەب و هونەری کلاسیکدا.

ئەفلاتوون لە فەلسەفەکەیدا زۆربەی کات پەنای بردووەتە بەر ئەفسانە، ئایدیالیزمانە دنیا و فەلسەفەی هونەری لێک داوەتەوە. هەرچی ئەرستۆیە بەرهەمە وێژەیی و هونەرییەکانی سەردەمی خۆی ریالیزمانە هەڵسەنگاندووە و پشتی بە مێتۆدی زانستیانە بەستووە. بۆیەش ڕافائێلی پەیکەرتاشی ئیتاڵی لە تابلۆیەکی خۆیدا ئەفلاتوونی وا نیشان داوە کە دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردووەتەوە، کەچی ئەرستۆی وا نیشان داوە کە دەستی بۆ زەوی درێژکردووە. مەبەستی ئەمە بووە: ئەفلاتوون ئایدیالیست و ئەرستۆ ریالیست بووە.

کتێبی «هونەری شیعر Poetica »ی ئەرستۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٤٩٨ لە ڤینیس تەرجومە کرا و بە

ئیتالْی بڵاوبووەوە. لە ٢٦ بەش پێکهاتووە:

ئەرستۆ لە کتێبەکەی خۆیدا بنەماکانی داهێنانی ئەدەبی و هونەری دەستنیشان دەکات. پاشان شیعر و تراژیدیا و کۆمێدیا و لاساییکردنەوە و دراما و مۆسیقا و شانۆ دەخاتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەیەکی وردەوە. هۆی پەیدابوونی شیعر و چەشنەکانی لاساییکردنەوە و ئامرازەکانی لاساییکردنەوە دیاری دەکا. لە بابەت و چەشنەکانی تراژیدیا دەکۆڵێتەوە، ئنجا دێتە سەر باسکردنی ئەو هەڵانەی کە لە شیعر و هونەردا، واتە لای شاعیر و هونەرمەند بەدی دەکرێن.. پاشان بەراوردکردنی شیعری تراژیدی و شیعری پاڵەوانێتی.

ئەرستۆ لە کتێبەکەیدا، ڕەخنەگرانە و بەفراوانی، باسی بەرهەمە شانۆییەکانی هاوچەرخانی خۆی کردووە؛ هەروەها باسی جیاوازییەکانی تراژیدیا و کۆمێدیا، داستان و چیرۆک و توخمەکانیان.

ئەرستۆ لە بواری ڕێبازی لێکۆڵینەوەدا مێتۆدێکی ئیستیدلالیی Deduction بەکارهێناوە، واتە لە هەموانییەوە بۆ هەندەکی (جزئی) شۆڕدەبێتەوە؛ بەمەش توانیویەتی وەڵامی چەندین پرسیاری گرنگ بەوردییەوە تۆمار بکات: شیعر چییە؟ جیاوازیی نێوان شیعر و پەخشان چییە؟ شاعیری ڕاستەقینە کامەیە؟ شیعر بۆچی دەنووسرێ؟

ئەرستۆ لاساییکردنەوە بە غەریزە دادەنێ و دەڵێ: "شاعیران بە ئامرازی جۆراوجۆر، یان بە بابەتی جیاجیا، یانیش بە شێوازی جیاواز لاسایی دەکەنەوە".

ئەرستۆ لە سەرەتای بەشی سێیەمدا دەڵێ: ڕووداوەکانی تراژیدیا هەستی بەزەیی و ترس لە دەروونی بینەردا دەورووژێنن، ئەمەش ئەنجامێکی باشی هەیە"، هەروەها دەڵێ: "هەموو تراژیدیاکان ئەمانەیان تێدایە: دیمەنی شانۆیی، گرێ، گوفتار، مۆسیقا و گۆرانی، بیر". پاشان باسی جۆرەکانی تراژیدی دەکات: تراژیدیای ئاوێتە، تراژیدیای ساکار، تراژیدیای هەڵچوو، تراژیدیای ئاکاری".



پێترارک

به ڕای ئەرستۆ دەبێ عەقڵ لە شیعردا سەرمەشق بێت. ئەگەریش پەنای بردە بەر سۆز و ویژدان و هەڵچوونی دەروونی، ئەوا نابێ لەو سنوورە تێ بپەڕێنێ کە ئەقڵ دایناوە. لە شیعر و هونەر و ئەدەبیاتدا دەبێ باس لە شتی هەمەکی و گشتی بکرێت.

بە بۆچوونی ئەرستۆ '' ئەرکی شاعیر ئەوە نییە ئەو شتانە بگێڕێتەوە کە ڕوویان داوە، بەڵکو پێویستە ئەو شتانە باس بکات کە لەوانەیە ڕوو بدەن. مێژوونووس ئەو شتانە دەگێڕێتەوە کە ڕوویان داوە شاعیریش ئەو شتانە باس دەکات کە لەوانەیە ڕووبدەن''.

هەروەها دەڵێ: ''ئەگەر شاعیر شتێکی ناماقووڵی هێنا و زانی چۆن ڕوواڵەت و بەرگێکی ڕاستەقینەی بەبەردا بکات، هەرچەند ئەمە عەقڵ نایبڕێ، بەڵام بۆی هەیە ئەمە بکات''.



ڕاسین

### ٢- هونەری شیعر

نووسراوی هۆراس Horace (٦٥- ٦٨ پ. ز).

«هونەری شیعر»ی هۆراس بە دووەم سەرچاوەی کلاسیزم دادەنرێ. هۆراس لەم کتێبەیدا بەدرێژی لە جۆرەکانی هونەر و ئەدەب، بەتایبەتی لە تراژیدیا و کۆمیدیا، هەروەها لە بنەماکانی دراما و جۆرەکانی شانۆنامە و شیعر دەدوێ، ئنجا چەند مەرجێکیش بۆ شانۆنامە دەستنیشان دەکات.

هۆراس یەکەم کەسە کە تێگەیشتنی کلاسیزم و مەرجی کلاسیزم بوونی لەگەڵ مەرجی گەڕانەوە بۆ کۆن گرێ داوە.

کتێبی هونەری شیعری هۆراس لەم بابەتانە دەکۆڵێتەوە:

١- بەرزی و جوانیی ئەدەبیات و هونەری گریک و یۆنان.

٢- مەبەست و ئامانج و ئەرکی ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەت. لەم بارەوە دەڵێ: ''مەبەستی شاعیران یا سوودبەخشینە یا چێژپێگەیاندنە یان لە یەک کاتدا

ئارەزووبزواندن و پەندەکانی ژیانە".

٣- لە بەشی درامادا کۆمەڵێک بیر و ڕا لە بارەی شانۆ (تراژیدیا و کۆمیدیا) دەردەبڕێ کە بەگشتی لە ئەرستۆ وەرگیراون. هۆراس لەگەڵ ئەوەش هەندێ مەرج و بنەما و خاسیەت دەستنیشان دەکا کە پێویستە لە شانۆدا هەبن. بۆ نموونە بە ڕای ئەو شانۆنامە دەبێ لە ٥ پەردە پێکهاتبێ.

٤- سنعەتبوونی ئەدەب و هونەر.

باس لە پیشەسازیی هونەر دەکات، ئنجا بایەخی بەهرە و خەیاڵفراوانی لە کاری داهێناندا ڕوون دەکاتەوە. هەروەها باس لە بەرهەمی باش و خراپ دەکات و لە یەکتریان جودا دەکاتەوە.

٥- مەرجەکانی شاعیری چاک دەستنیشان دەکات.

## ٣- کولتووری ڕێنسانس

بزووتنەوەی ڕێنسانس Rennaissance لە ماوەی سەدەی ١٥م و ١٦مدا ڕۆڵێکی مەزنی بینی لە بەرەوپێشەوەبردنی ڕێبازی کلاسیزم. جێی سەرنجە بزووتنەوەی ئوومانیستەکان Humanisme لە سەدەی ١٥مدا ڕوویەکی گەشی بزووتنەوەی ڕێنسانس بوو.

هەروەها بزووتنەوەی ڕۆشنگەری Enlightenment کە بزاڤێکی هزری بوو - لە کۆتایی سەدەی ١٧ دەستی پێکرد و بە درێژایی سەدەی ١٨ ئەورووپای هەژاند و ناوەندەکەیشی پاریس بوو- ئەویش ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە بڵاوکردنەوەی پرەنسیپ و دەستوورەکانی کلاسیزم.

بەم شێوەیە بەرهەمی نووسەر و فەیلەسووفەکانی سەردەمی ڕێنسانس Rennaissance و ڕۆشنگەری Lage des lumieres بوونە چەند سەرچاوەگەلێکی دیکەی کلاسیزم.

مێژوونووسەکان مێژووی گەلانی ئەورووپا بەسەر سێ چاخ دابەش دەکەن:

١- چاخی کلاسیکی دێرین Antique (سەردەمی



Donatello (1386?-1466):
Madeleine – vers 1455.
Bois polychrome – H. 1,88 m.
Florence, Baptistère.

پەیکەرێکی کلاسیک

دەسەڵاتداریتی گریک و رۆمان، کە پێش لەدایکبوونی مەسیح دەگرێتەوە). هەندێ رەخنەگر وای دەبینن کە ئەدەبیاتی ئەم سەردەمە (سەردەمی یۆنان و رۆمانی دێرین) کلاسیزمی کۆنە، ئەو کلاسیکەی دواتری ئەورووپاش کلاسیزمی نوێیە.

٢- چاخەکانی ناوەراست، کە بە سەردەمێکی زۆر تاریک دەژمێردرێت لە ئەورووپادا، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت بە ئەورووپادا دەست پێدەکات تا کۆتایی سەدەی ١٦م. بەسەر دوو قۆناغ دابەش دەکرێ:

یەکەم: چاخەکانی ناوەراستی بەرایی، واتە پێش رێنسانس، کە دەسەڵات و بۆچوونی کەنیسە تێیدا باڵادەست بوو، لەگەڵ هەرچی بینینێکی میتافیزیکیانە و ئاخیرەتپەرستانە و فەرامۆشکردنی دنیا.

دووەم: چاخەکانی ناوەراستی دواتر (سەردەمی رێنسانس، واتە سەدەی ١٥ و ١٦م) کە بیرکردنەوەی زانستی و مێتۆدباوەری و دنیاباوەری سەرهەڵدەدەن.

٣- چاخی نوێ. بە بۆچوونی ئارنۆڵد هاوزەر: نوقتەگۆرانی راستەقینە، واتە «چاخی نوێ» تەنیا لەگەڵ هاتنی سەدەی هەژدەمەوە (لەگەڵ هاتنی سەردەمی رۆشنگەرییەوە) دەست پێ دەکات.

سەردەمی رێبازی کلاسیزم (چاخەکانی ناوەراست تا رێنسانس: لە دوای بڵاوبوونەوەی مەسیحییەتەوە تا کۆتایی سەدەی ١٦م) لە بواری سیستەمی سیاسییەوە بە قۆناغی هێرارشی Herarchie دەناسرێتەوە لە بواری فەرمانرەوایەتیدا: پاشایەتی لە باوکەوە بۆ کور دەگوازرایەوە. حکومەت زۆر توندرەوانە فەرمانرەوا بوو. پاشا، کە "خودا" مافی دەسەڵاتی پێدابوو فەرمانرەوای موتڵەق بوو. خۆشەویستیی وڵات دەبووایە تێکەڵ بێت بە خۆشەویستی بۆ پاشا؛ دروشمی هەموو کەسێک ئەمە بوو: " یەک قانوون، یەک دین، یەک



کۆرنەی

پاشا "Une Loi, une foi, un Roi". کلاسیزم ئەم دەستوورانەی بە موتڵەق دادەنا و نەدەبووایە لێی لابدرێ.

ژیانی ناو دیوەخان و سالۆنە ئەدەبییەکانی چینی بەگزادە تابڵێی درەوشاوە و جیلوەدار بوو. هەموو کەس دەبووایە زۆر بەوردییەوە پەیڕەوی داب و دەستووری بکردایە. نەزانین و پەیڕەونەکردنی دەستوور و یاسا واتای خەشیمی و کەم نەزانین بوو، جێگای گاڵتەپێکردن بوو لە لایەن خەڵکەوە. بەم شێوەیە ژیانی ئەدەبیش دەبووایە پەیڕەوی هەمان دەستوور و یاسا بکات. ئەدەب و هونەر لەوکاتەدا ئەدەب و هونەر بوو کە دەرسێک فێری مرۆڤ بکات و لە خزمەتی "ئەخلاق"دا بێت.


ژان راسین

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا (پێش ڕێنسانس) هونەر بەگشتی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی کلێساوە. پیاوانی ئاینی بەو چەشنەی لەگەڵ بیروڕای کلێسەدا بگونجێ، هونەریان ئاراستە دەکرد و دەیانویست لە خزمەتی ئاین و پیاوانی ئایندا بێت. شیعر و چیرۆک و شانۆ و پەیکەرتاشین و نیگارکێشان، بە ڕادەیەک کەوتنە ژێر چاوەدێری و فەرمایشتی پاپا و قەشەکانی کلێسا کە هیچ نووسەر و هونەرمەندێک بۆی نەبوو سەرپێچی لە ئاستیدا بکا.

هەر بۆیە فەیلەسووفانی ئێستاتیکا ڕایان وایە کە ڕێنسانس قەڵەمبازێکە بەسەر سەدەکانی ناوەڕاست و بیروڕای کلێسە؛ هەوڵدانێکی مەزن بووە بۆ ڕزگارکردنی ئادەمیزاد لەو کۆت و پێوەندانەی ئێستاتیکای دەرەبەگایەتی، کە لە دەست و پێی نووسەر و هونەرمەندان توند کرابوو.

ڕێنسانس Rennaisance کە بە فەرەنسی واتای بووژانەوە یان ڕاستتر لەدایکبوونەوە دەگەیەنێ، بریتییە لەو بزووتنەوە فراوانە ئەدەبی و هونەری و زانستی و شارستانییەی کە لە ماوەی سەدەکانی ١٥ تا ١٦ لە ئیتاڵیا سەری هەڵدا و پاشان هەموو ئەورووپای

گرتەوە. جێی سەرنجە ئەم بزووتنەوەیە، سەرەڕای تازەگەری و داهێنانەکانیشی، لەسەر بنچینەی گەڕانەوە بۆ ڕیشە شارستانییەکانی ئەورووپای کۆن Antiquite دامەزرابوو: زیندووکردنەوەی کولتووری دێرین و ئەدەبیاتی کۆن بەشێوەیەکی تازە و داهێنەرانە.

پەرەسەندنی بازرگانی ڕۆڵی زۆر بوو بەسەر پەرەسەندنی سیستەمی پەروەردە. فێربوونی خوێندنەوە و نووسین، -کە گرنگ بوو بۆ بازرگانی- لە سەردەمی پێش ڕێنسانسدا بەدەست کڵێسا و قەشەکانەوە بوو. لە سەردەمی ڕێنسانسدا گوازرایەوە دەست توێژی بازرگان و چینی بۆرژوای ئەکتیڤ.

بازرگانی پێویستی بە فێربوونی زمانی دیکەی غەیری لاتینییەوە هەبوو. ئیتر بۆیە خەڵک وردە وردە دەستیان کردە خۆفێرکردنی زمانە ناوچەییەکان، ئەمەش لە قوتابخانە عەلمانییەکانی دەرەوەی کەنیسەی قەشەکاندا. کەواتە، فێربوون و بەکارهێنانی زمانە ناوچەییەکانی غەیری لاتینی، وردە وردە، بووە هۆی ئەوەی کە خوێندەواری وەک ئیمتیازێکی کەنیسە و پیاوانی دینی نەمێنێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە وای لێهات کە خوێندەواری مۆرکێکی عەلمانی بەخۆوە بگرێت و ڕۆشنبیرییەکی فراوانتر بگرێتەوە.

گۆڕانکارییەکانی سەردەمی ڕێنسانس هەر لە سەدەی پازدەمەوە دەستیان پێکرد: لاچوونی یاسای کۆیلایەتی و سوخرە، لە جیانی ئەمەش بەکارهێنانی پارە وەک پێوەرێکی پەیوەندییەکانی نێوان جوتیار و ئاغاکان، کەمبوونەوەی بەرهەمهێنانی دەست و جێگەگرتنەوەی بەرهەمهێنانی وەرشە و کارگەکان و سەرمایەداری، دۆزینەوە جوگرافییەکان، پەرەسەندنی بازرگانی کە لە کۆتاییدا گەیشتە کۆلۆنیاڵکردنی وڵاتان و سوودوەرگرتن لە سامانەکانیان.

یەکێک لە دەسکەوتەکانی سەردەمی ڕێنسانس دروستبوونی دەوڵەت – نەتەوە بوو، واتە دروستبوونی دەوڵەت لەسەر بنچینەی نەتەوە. ئەمە وای کرد زمانی


دیدرۆ

لاتینی کە زمانی نووسینی زۆربەی نەتەوەکانی ئەورووپا بوو وردە وردە بداتە پاش و زمانی نەتەوەکان برەو بسێنێ و هەر نەتەوەیەک زمان و رۆشنبیریی نەتەوەیی خۆی ببووژێنێتەوە. لە فەرەنسا بۆ نموونە لە سالّی ١٥٣٩ مەرسوومێکی پاشایەتی دەرکەوت کە رێگەی دایە بەکارهێنانی زمانی فەرەنسی لەناو دادگاکاندا و لەناو هەموو مامەڵەیەکی ئۆفیسال و تایبەتیشدا. لێرەشەوە زمانی فەرەنسی ئیتر بووە زمانی تەدارەکە دینییەکانی ناو کەنیسە پرۆتێستاییەکان. پاشانیش ژمارەی کتێبە زانستییەکان وردە وردە رووی لە زیادبوون کرد و ئیتر وردە وردە خەڵک بەوە راهاتن کە زمانی لاتینی پشتگوێ بخەن: زمانی فەرەنسی یان زمانە نەتەوەییەکانی دیکەی وەک ئیتاڵی و ئیسپانی و ئینگلیزی بۆ نووسین بەکاربێنن و ئەدەبیاتێکی نەتەوەیی لەدایک ببێت.



میناتۆرێکی کلاسیک

لەگەڵ ریشەداکوتانی دەوڵەت – نەتەوە لە ئەورووپا، رێنسانس پێگەیشت کە مەبەستی رووخاندنی رۆشنبیریی دەرەبەگایەتی و باوەڕی کلێسایی بوو بۆئەوەی رۆشنبیرییەکی دنیایی و بزووتنەوەیەکی عەقڵانی جێی بگرێتەوە. هەر ئەم رێنسانسە فراوانەش بوو کە، دواتر، رۆڵی بینی لە هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسا لە سالّی ١٧٨٩دا.

هەر بۆیەش دەبینین رۆشنگەرەکان، دواتر، بنەماکانی رێنسانسیان بە پاڵپشتێک دادەنا بۆ خۆیان لە خەباتی خۆیاندا دژی کەنیسە.

رێنسانس لە سەرەتادا لە ئیتالیا، پێش وڵاتانی تر پەیدا بوو. هۆیەکان ئەمانە بوون:

١- ئیتاڵیا لە رووی پیشەسازی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە پێشکەوتووتر بوو: چەندین بانک و کارگەی مەزن لە شارە گەورەکانی وەکو فلۆرەنسا و ڤینیس دامەزرابوون.

٢ – ئیتالیا مەڵبەندی بازرگانی بوو، ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ئەورووپا و رۆژهەڵات بوو.

٣ - پاپا نیکۆلای پێنجەم ژمارەیەک لە نوێنەرانی خۆی بە ئەورووپادا بڵاوکردەوە بۆئەوەی دەستنووسی کۆن کۆبکەنەوە و لێکۆڵینەوان ئەنجام بدەن. بەمەش کتێبخانەی ڤاتیکان دەوڵەمەندتر بوو.

٤ - ئیتاڵیا هەر لە کۆنەوە لانکەی شارستانییەت و رۆشنبیری بووە؛ کەڵە داهێنەکانی وەکو لیۆناردۆ دافینشی و مایکڵ ئەنژێلۆ و رافائێل و دانتی و بۆکاچیۆ و پێترارک هەموویان ئیتالی بوون.

بزووتنەوەی رێنسانس وردە وردە بە وڵاتانی دیکەی ئەورووپادا بڵاوبووەوە. هەر وڵاتێک بەشێوەیەکی جیاواز ئەم بزووتنەوەیەی تێدا بەرپا دەبوو: بۆ نموونە لە ئەڵمانیا رێنسانس بریتی بوو لە ریفۆرم و چارەسەرکردنی کەنیسە، فەرەنسییەکان روویان کردە لێکۆڵینەوەی قانوون و رۆمانییە کۆنەکان. ئینگلیزەکانیش لە فەلسەفە و ئێستاتیکایان کۆڵییەوە. ئیتاڵییەکانیش بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو بوارەکاندا. داهێنێکی وەکو لیۆناردۆ داڤینشی پەیکەرتاش و پزیشک و نووسەر و ئەندازیار بوو، لە هەمان کاتدا نیگارکێشێکی بلیمەتیش بوو.



تابلۆیەکی کلاسیک

یەکێک لە ئاکامەکانی رێنسانس ئەوە بوو کە زمانی نەتەوەیی یەکگرتوو لای میللەتانی ئەورووپا، هەروەها هەستی نەتەوایەتیشی لای ئەو نەتەوانە بووژاندەوە. بۆیەش دەبینین لە سەردەمی رێنسانسدا، دوو ئاراستەی هونەریی بنجی تێکەڵ بە یەکتر دەبن: کولتوورێکی دێرینی هونەری، لەگەڵ نەریتە نەتەوەییەکانی گەلانی نوێی ئەورووپا. جگە لەمانەش بایەخدان بە دەستنووسی کۆن و لێکۆڵینەوەیان و لەبەرگرتنەوەیان، هەروەها داهێنانی چاپخانە (گۆتێنبێرگ لە ساڵی ١٤٤٥ لە ئەڵمانیا) و بەرەوپێشەوەچوونی چاپخانە و داهێنانی چاپکردنی نوێ لە خانەی دەسکەوتە زانیاری و کولتوورییەکانی رێنسانس دادەنرێ. هەموو ئەمانە پێکەوە رێگایان بۆ چاخێکی نوێ و بۆ بووژانەوەی رێبازی کلاسیزم خۆش کرد.

ئوومانیزم Humanisme ئەو بیر و بنەمایانە بوون کە لە سەدەی پازدەمدا، هاوکاتی رێنسانس، مەبەستیان پەرەسەندن و بووژاندنەوەی مرۆڤ بوو؛ ئوومانیزم بزووتنەوەی مرۆڤپەروەرەکانی سەردەمی رێنسانسی ئەورووپا بوو، کە سەرلەنوێ بایەخیان دایەوە بە زمان و ئەدەبیاتی کۆن و رۆم. بایەخدانی ئوومانیستەکان بە کەلەپووری کۆن یەکێک بوو لە خاسیەتە بنچینەییەکانی رۆژگاری رێنسانس.

لە سالآنی ١٥٤٦ تا ١٥٥٠ لە ناکاو کۆمەڵێک نووسەر و هونەرمەندانی گەنجی فەرەنسی، کە درەنگتر ناویان لێ نرا ئوومانیست، گەیشتن بە دۆزینەوەی بیری ''جوانی'' لە هونەر و ئەدەبیاتدا: ''ئامانجیان ئەوە بوو کە پێ لەسەر سیما دونیاییەکەی زانست و ئەدەب دابگرن و بایەخ بە ئادەمیزاد بدەن.

ئەم نووسەر و هونەرمەندانە ئاشنایەتییەکی تەواویان لە بارەی ئەدەبیاتی یۆنانیی کۆن و ئەو نووسەرانە هەبوو کە بەرهەمەکانی خۆیان بە لاتینی دەنووسی. رۆنسارد Ronsard و دۆرا Daurat و دۆبلێ Dubellay نموونەی نووسەرانی ئەم قۆناغەن، کە شاکارەکانی هۆمەر و سۆفۆکلیسی یۆنانییان خوێندبووەوە و کۆمەڵەی حەوت کەسییان بە ناوی «چلچرا» یان بە فەرەنسی پلێیاد Pleiade دامەزراند کە (٧ نووسەری فەرەنسی بوون لە سەردەمی هینریی دووەمدا ١٥٤٧- ١٥٥٩). پاشانیش دۆبلێ Dubellay خاوەن کتێبی ''بەرگریکردن لە زمانی فەرەنسی''رایگەیاند کە «تا ئەو رۆژە شاعیرانی فەرەنسی لە جاهیل زیاتر هیچی تر نەبوون؛ تەنیا شاعیرانی یۆنانی و لاتینی شاعیری راستەقینەن، فەرەنسییەکان پێویستە شوونپێی ئەوان هەڵبگرن و بگەنە ئاستی ئەوان». دۆبلێ رای وابوو کە تەنانەت پێویستە جۆر و رەگەزە ئەدەبییەکانی یۆنانیی کۆن دەقاودەق بگوێزرێنەوە ناو ئەدەبی فەرەنسی و بەکاربهێنرێن.



ناپلیۆن

وێرای کۆششی ئوومانیستەکان (رۆنسار و دۆبلێ و

ئەوانی تر)، تۆژەران کەوتنە ئەوەی کە دەستوور و یاساکانی ئەدەبیاتی یۆنانی و رۆمانیی کۆن لێک بدەنەوە و شرۆڤە بکەن، ئنجا پاشان لاساییان بکەنەوە و پەیرەوی یاساکانیان بکەن لە نووسینەکانیاندا.

ئیسپانی و ئیتالییەکان لەم بارەیەوە پێش فەرەنسییەکان بوون. ئەم گەڕان و کۆششە لە ئیسپانیا لە ساڵی ١٥٩٦ تا ١٦٤٠ درێژەی کێشا، بەڵام دەبێ بگوترێ کە ئیسپانییەکان هیچ جۆرە تەئسیرێکیان بەسەر فەرەنسییەکانەوە نەبوو. فەرەنسییەکان لەم بارەیەوە زیاتر قەرزاری ئەرستۆ و ئیتالییەکان بوون. مامۆستای گەورەی ئەم ڕێبازە لە فەرەنسا بوالۆ Boilod بوو، کە یاساکانی کلاسیزمی بۆ فەرەنسییەکان بەشێوەیەکی ورد لێک دایەوە. لای کلاسیکەکان، هونەر و ئەدەبی ڕاستەقینە بریتی بوو لە پەیڕەوکردنی ئەو دەستووره "کلاسیکانە" کە بوالۆ لە کتێبەکەی خۆیدا Art Poetique دایڕشتبوو.



مۆلیێر

قۆناغی ١٥٥٠ تا ١٥٩٠ دەتوانرێ ناوی لێ بنرێت قۆناغی ڕێنسانسی ئەدەبی فەرەنسی. لەم قۆناغەدا نووسەران و شاعیرانی فەرەنسی بەشێوەیەکی فراوان کەوتنە لاساییکردنەوەی نووسەرانی یۆنانی و ڕۆمانیی کۆن، هەروەها پەیڕەوکردنی دەستوورەکانی نووسەرانی هاوچەرخی سەر بە ڕێنسانسی ئیتالی. لە نووسەرانی ئوومانیستی ئەم قۆناغەی ڕێنسانسی ئەدەبی فەرەنسی: ڕۆنسار Ronsard و دۆبلێ و مۆنتاین Mon-tagne، هەروەها ڕاسین Racine، مۆلیێر Moliere، لافۆنتێن La Fontaine، لابرویێرLa Bruyere، مەدام دوو لافاییەت Mme de Lafaytte، بۆسوێت Boussuet.

بەم شێوەیە کلاسیزم لە ئەدەبی فەرەنسی هەر لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەوە دەبینرێت. داستانی (عەزرا یان ئازادکردنی فەرەنسا) کە لە ١٦٥٦ لەلایەن ژان شاپلان ١٥٩٥- ١٦٧٤ نووسراوە و پاڵەوانەکەی بریتییە لە ژان دارک، بەرهەمێکی پایەداری کلاسیزمی فەرەنسییە. لەسەر داخوازیی کاردینال ڕێشیلیۆ

نووسرابوو: له پێناو ڕق ئەستوورکردنی فەرەنسییەکان بۆئەوەی داگیرکەرە ئینگلیزەکان لە خاکی فەرەنسا بچنە دەرەوە.

پاشان ئەکادیمیای فەرەنسی لە ساڵی ١٦٣٤دا لەسەر دەستی ڕیشیلیۆ دامەزرا و زمان و ئەدەبی نەتەوەیی فەرەنسیی بەرەوپێشەوە برد. لە کۆتاییشدا دۆبلێ لە ١٥٤٩ بەرهەمە ناودارەکەی خۆی «بەرگریکردن لە زمانی فەرەنسی» بڵاوکردەوە.

کلاسیزمی فەرەنسی لە ١٦٦٠ تا ١٦٨٠ لە گەیشتبووە لووتکەی پەرەسەندنی خۆی. ئەمەش لە سەردەمی لویسی چواردەمدا و بەو ئەدەبیاتەی کە ڕاسین Racine ١٦٣٩- ١٦٩٩ و کۆرنێی Corneille (١٦٠٦-١٦٨٤) و بوالۆ و ئەوانی تر دروستیان کردبوو.



بیناسازیی **ڕۆکۆکۆ-کلاسیزم**

## دەستوور و یاساکانی کلاسیزم

### ١- لاساییکردنەوەی سروشت

بوالۆ، یەکێک لە تیۆردارێژەکانی کلاسیزمی فەرەنسا، لە بەشی سێیەمی "هونەری شیعر"دا دەڵێ: تەنانەت یەک چرکەش لە سروشت غافڵ نەبی!

جێی سەرنجە، نووسەرانی ڕێبازەکانی دیکەش لاسایی سروشت دەکەنەوە، بۆ نموونە ڤیکتۆر هووگۆی پێشەوای ڕۆمانسیزم کە دەیگوت: "سروشت، سروشت و ڕاستی"، هەروەها ئەمیل زۆلای دامەزرێنی ڕێبازی ناتورالیزم "سروشتخوازی" کە واتێدەگەیشت خۆی سروشتی وەکو توخمێکی تازە بۆ یەکەمین جار هێناوەتە ناو ئەدەبیاتەوە.

کەواتە لاساییکردنەوەی سروشت لای کلاسیکەکان نیشانە و خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە و جیاوازیی هەیە لەچاو لاساییکردنەوەی سروشت لای ڕۆمانسی و ناتورالیستەکان.

لای کلاسیکەکان دەبوایە سروشت تەنیا شتە باش و ناواخنە ئەخلاقییە بەرزەکانی لێ وەربگیرایە. کلاسیکەکان سروشتیان بەشێوەیەکی وا لە بەرهەمەکانیاندا باس دەکرد کە لەگەڵ ڕاستی و واقیع بگونجابایە و خزمەتی عەقڵ و ئەخلاقی باوی کۆمەڵی بکردایە، هەروەها باسی شتە ورد و پەراوێزی و لابەلاکانی سروشتیان نەدەکرد. ئەمە لەکاتێکدا ناتورالیزم سروشت و سروشتی مرۆڤایەتیی -وەک خۆی چۆنە ئاوها - بە هەموو گەندەڵی و خراپەییەکانیەوە دەردەبڕی. هەروەها ڕۆمانسییەکانیش تارایەکی جیاواز و دروستکراوی خۆیانیان دەدا بەسەر سروشت و سروشتی مرۆڤایەتیدا.

نووسەری کلاسیک، لەجیاتی ئەوەی وەسفی سروشت بکا، دەهات بە چەند وشە و دەستەواژەیەکی کەم و پوختەکراوە و بەهێز، سروشتی وا دەردەبڕی کە لەگەڵ ئامانج و نموونە بەرزەکانی مرۆڤ یەکانگیر ببێتەوە.

نووسەری کلاسیک هەرگیز سیفاتە ناشیرینەکانی سروشت و خەسڵەتە خراپەکانی سروشتی مرۆڤایەتی وێنە ناکێشێ. یاسای کلاسیزم ڕێ لەم کارە دەگرێ. بوالۆی ڕەخنەگریش خۆی لەم کارە بەدوور ڕاگرتووە، چونکە بەپێی کلاسیزم: ئەم سیفەت و نیشانە خراپە سروشتیانە لە ئاژەڵیشدا هەن و مرۆڤ زۆر لەو خەسڵەتانە باڵاترە. مرۆڤ نابێ ببێتە ئەسیری غەریزە و لایەنە خراپەکانی سروشت، نووسەر نابێ ئەو لایەنە سروشتییە خراپانە بەیان بکات.



منارەیەکی سەردەمی **کلاسیزم**

### ٢- لاسایی کردنەوەی کۆنینەکان

نووسەرە گریکەکان و ڕۆمانییەکانی پێش لەدایکبوونی مەسیح توانیویانە لە پەند و دیاردەکانی ژیان و سروشتەوە شتە هەرە باشەکان و ڕاستییە هەرە بەرزەکان هەڵبژێرن و بەیان بکەن، کەواتە پێویستە لاسایی ئەوان بکرێتەوە و پەیڕەوی دەستوور و شێوازەکانی ئەوان بکرێ.

کـلاسـیـکەکـان دەڵێـن: بۆ دۆزینەوەی جـوانیـی نەمـر پێـویـسـتـە ئێـمـە لەناو بەرهەمی نووسـەرە کـۆنینەکـدا بگەڕێین، واتە پێـویـسـتـە بەرهەمی نووسەرە یۆنانی و لاتینیـەکـیـانی وەکـو ئۆریپـیـد Euripide و ڤـێـرژیل و سۆفـۆکلیس و ئێـزۆپ Esope و هۆمـێـرۆس و هۆراس و ئەرستۆ بکرێنە سەرمەشق، هەمان شێواز و تەکنیک و بابەت و کـەرەسـتـە و فـۆرم و ڕەگـەزە ئەدەبیـیـەکـانی ئەوانیش پەیڕەو بکرێن و لاسایی بکرێنەوە. هەر بۆیەش ڕاسین لاسـایی ئۆریپـیـد و لافـۆنتـێن لاسـایی ئێـزۆپی Esope کـــردووەتەوە. هەروەها دانتی و پێـــتـــرارک و بۆکاچیۆ ببوونە نموونەی لاساییکردنەوە.

شانۆنامـەی ئاندرۆمـاک Andromaque شـانۆنامـەیەکە لە پێنج پەردەدا نووسـراوی شـانۆنامـەنووسی فـەرەنسی ڕاسین Racine، بەڵام ئۆریپـیـدسی گـریک لە سـاڵانی پێش زایندا ئەم شـانۆنامـەی نووسـیـوە و ڕاسین لەوەی ئەوی وەرگرتووە و جارێکی دیکە دایهێناوەتەوە.



ڤۆلتێر

ئەم لاسـایی کـردنەوەش، بە لای کـلاسـیـکەکـان، ئەسیربوون نیـیـە، بەڵکو ڕێزگرتنی عـورف و عـادەت و قـانوونە. ڕەخنەگـری کـلاسـیـکی فـەرەنسی، بوالۆ، لەم بارەیەوە دەڵێ: "هەمـوو شـتـێک گـوتراوە، بەڵام هیچ شـتـێک هێشـتـاش هەر کـامڵ نەبووە" بۆیە پێـویسـتـە ڕاستییەکان لە هەموو قۆناغێکدا دووبارە بگوترێنەوە و دووپات بینەوە. لە هەمان کاتدا پێویستە نووسەر شوێن پێی یاسـا و شـێـوە کـۆنەکـانیش هەڵبگرێ: زمـانی دەربڕین، تەکنیک، شێواز، کێش، سەروا، هونەرەکانی ڕەوانبێژی.

### ٣- کۆن گێڕانەوە

مێژوو و چیرۆکە مێژووییـیـەکان وەک کەرەستـەیەکی گـرنگی شـانۆی کـلاسـیـزم ڕێزیان لێ گـیـراوە و بەردەوام لەلایەن کلاسیکەکانەوە وەک هەوێنێک بەکارهێنراون.

گـێـڕانەوەی سـەرگـوزشـتـە و چیـرۆک و ڕووداوی مێژوویی و دێرین (بۆ نموونە یۆلیـۆس قەیسەر و هاملێت

و ئۆتێللۆ... وەک لای شکسـپـیـر دەبینین)، هەروەها کەرەستە و بابەتە گریکی و ڕۆمانییە کۆنەکان بابەت و کەرەستەی دەربڕینی سەرەکیی کلاسیکەکان بوون. ئەو کـەسـەی لەو یاسـایە دەرچووبایە بە دزێو دەبینرا. بۆ نموونە ژان ڕاسین (١٦٣٩ - ١٦٩٩) جارێکیان هەندێ ڕووداوی مێژوویی نزیکی کردبووە بابەتی شانۆنامەکانی دەیان ڕەخنەی لێ گـیـرا. لەم بارەیەوە ڕەخنەگـری میسری، محەمەد مەندور دەڵێ: '' ئەم تیۆرە بابەتیتر Objective و گـونجـاوتر بوو لە ئەدەبی زاتی -Sub jective''.



سەردەمی **باڕۆک - کلاسیزم**

### ٤ - **عەقلانییەت** Rationalisme

عـەقڵ بە توخـمێکی بنچـینەیی دادەنرێ، بناغـەی فەلسەفەی جوانییە لە داهێنانی ئەدەبی کلاسیکیدا، چونکە لای ئەوان، عـەقڵ تیشکدانەوەی ڕاسـتـییـە، ڕاسـتـیش لە هەمـوو سـەردەم و شـوێنێکدا نەگـۆڕ و یەکسانە و بەردەوام دەمێنێتەوە.

فـەلسـەفـەی عـەقـلانـیـیـەت واتە هـۆشـگـەرایـیRationalisme کـە دیـکـارت و فـەیلەسـووفـەکـانی دیکەی ڕێنسـانس و ڕۆشنگەری دایانهێنا و پەرەیان پێدا، بڕبڕەی پشتی کلاسیزمە. عـەقڵ، لای ئەوان، بە توخـمێکی بنچینەیی دادەنرێ؛ بناغـەی فەلسەفەی جوانییە لە داهێنانی کلاسیکدا. چونکە لای ئەوان، عـەقڵ تیشکدانەوەی ڕاسـتـییـە، ڕاسـتـیش لە هەمـوو سـەردەم و شـوێنێکدا نەگـۆڕ و یەکسانە و بەردەوام دەمێنێتەوە.

عەقڵ خەیاڵی مرۆڤ بەرەو ڕێگایەکی ڕاست ڕێبەری دەکـات و سنوورێکی بۆ دادەنێ، وا لە مـرۆڤ دەکـات پەیڕەوی یاسا گشتییەکان بکات. هەر لێرەشەوە، عەقڵ واتای ئەوە دەگـەیەنێت کـە تۆ پابەند بیت بە یاسـا گشتییەکان، کە تۆ پابەند بیت بە عورف و عادەت و ئەخلاقی باو: «عاقڵ بە !» واتە «لەسەر ئەخلاقیـاتی باو بڕۆ!». ئەمـەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کە کلاسیزم

ئازادیی تاکەکەسی دەخستەوە ژێر جڵەوی کۆمەڵ.

ئایا هەبوونی بنچـینەی عـەقڵ لای کـلاسـیکەکـان دەگـەڕێتـەوە بۆ ئەرسـتـۆ؟ ئەرسـتـۆ تەنیـا داوای ڕەچاوکردنی داب و نەریت و عورف و عادەتی دەکرد، بە ڕای ئەو نەدەبووایە نووسـەر لێـیـان لابدات. بۆیە کلاسیکەکان لەم بارەیەوە زیاتر قەرزاری دیکارتن کە لە «چەند وتارێک لە بارەی ڕەوشی بەڕێوەبردنی عـەقڵ»دا دەڵێ کە پێویستـە عـەقڵ و خـواست بەسـەر هەست و کـەفـوکـوڵی دەروونـدا زاڵ بن، چونکە عـەقڵ گـەورەترین نیشانەیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جودا دەکاتەوە.

بوالۆ لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا دەڵێ: "عەقڵ و لۆژیکتـان خـۆش بوێ. هەمـیـشـە گـەورەترین زینەت و بایەخی بەرهەمەکانتان لە عەقڵەوە وەربگرن".



بوالۆ

### ٥ - فێرکەر و خۆشبین

بە ڕای کلاسیکەکان، تەنیا بەرجەستەکردنی جوانی لە بەرهەمی ئەدەبیـدا بەس نیـیـە، بەڵکو بەرهەمی ئەدەبی پێـویسـتـە لە هەمـان کـاتدا فـێـرکـەر بێت و ئەنجـامگـیـریـیـەکی ئەخلاقـیش بەدەسـتـەوە بدات؛ ئەو دەرسەی کە بەرهەمێکی کلاسیک دەیبەخشێت پێویستە گەشبین بێت. هەر چۆنی بێ کلاسیکەکان هەموو لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کـە بەرهەمی ئەدەبی پێـویسـتـە ناوەرۆک و لایەنێکی ئەخـلاقـیی هەبێت. ئەمـەش بەتەواوەتی لەگـەڵ عـەقـڵگەرایی و فـەلسـەفـەی ڕاسیۆنالیزم یەکی دەگرتەوە.

### ٦ - ڕۆنی و کورتبڕی

بەرهەمی باش ئەوەیە کـە هەم شـێـواز و هەم بابەت و هەم زمـانی دەربڕین ڕۆن و ئاشکرا بێت. ئەمـەش واتای ئەوە نـیـیـە کـە ڕووکـەش و سـادە بێ، بەڵکو مـەبەست ئەوەیە کـە ڕسـتـەکـان بە وردی و باریکبـیـنیـەکی هونەرمـەندانەوە داڕێـژرابن، دوور بن لـە وشـە و دەستەواژەی زیاد و ناجۆر و ناقۆڵا.

زمانی کلاسیک فراوان نییه، وشەکانی سنووردارن و کەمن. دەڵێن کە ڕاسین لە هەموو بەرهەمەکانی خۆیدا زیاتر لە ٨٠٠ وشەی بەکارنەهێناوە. نووسەری کلاسیک لە بەکارهێنانی وشەدا زۆر دەستی گرتووەتەوە، وشەی ناباو و جۆراوجۆری کەم بەکارهێناوە.

یاسایەکی دیکەی کلاسیک ئەوەیە کە بیر و واتاکان بە کەمترین وشە بەیان کراون، واتە بە شێوازی کورتبێژی. بۆ نموونە ئەگەر شانۆنامەیەک دوو هەزار دێڕ بێت و پەندە ئامۆژگارییەکەی بگاتە سێ دێڕ، ئەوا ئەو پەندە بە درێژدادڕ لە قەڵەم دراوە. ڤۆڵتێر وتوویەتی: "هیچ شتێکی بێ سوود نابێ بگوترێ".



مۆنتسکیۆ

**٧ - لە ڕاستی چوون** Vraissemblance

"لە ڕاستی چوون"، لای کلاسیکەکان، لە هەموو بنچینەیەکی کلاسیکیی دیکە گرنگترە. ئەرستۆ لە بەشی نۆیەمی "هونەری شیعر" دا دەڵێ: "بەرهەمی شاعیر باس لەو شتە ناکا کە ڕووی داوە بەڵکو باس لە شتێک دەکات کە لە ڕووی پێویستییەوە دەشێ ڕووبدات یان پێ دەچێ ڕووبدات".

کەواتە جیاوازیی مێژوونووس و شاعیر لەوەدایە: مێژوونووس باس لەو شتە دەکا کە ڕووی داوە، بەڵام شاعیر باس لەو شتە دەکا کە لەوەدەچێ ڕووی بدایە یا ڕووبدا.

لای کلاسیکەکان ئەم بنچینەیەی 'لە ڕاستی چوون"، شتێکە پێویستە بیروڕای گشتیی خەڵک، هەموو، لەسەری ڕازی بن. واتە بۆ نموونە کاتێ نووسەر پاڵەوانێکی لە ڕاستچوو هەڵدەبژێرێ، پێویستە ئەو پاڵەوانە نموونەیەکی ناوێزە و سەرپەڕ نەبێت، هاوتیپی ئەو لە ژیاندا هەبێت و نموونەیەکی گشتیی توێژێک یا جۆرێکی خەڵک بێت.

**٨ - مەوزووعی بوون** Objectivite

مەوزووعی بوون، لە جیاتی زاتی بوون و خۆیی بوون

(کە لای رۆمانسییەکان دەبینرێ) یەکێکە لە خاسیەت و بنەما هەرە بنچینەییەکانی کلاسیزم.

مەوزووعی بوون واتە بەدەربوون لە بینین و بیروڕای خۆیی و زاتییانە، بەدەربوون لە هەوا و هەوەس و خەم و خەیاڵی خۆیی.

بایەخدان بە گشت و بە کۆمەڵ، نەک بە تاکەکەس، بنچینەیەکی دیاری کلاسیزمە. بۆیە داهێنی کلاسیست پاڵەوانی تاکڕەو زۆر کەم و بەدەگمەن دروست دەکات، بەدەگمەن سەرگوزشتە و چیرۆک و کارەساتی خۆیی یان هی تاکەکەس دەگێڕێتەوە. بۆیەش لە بەرهەمە شانۆییە کلاسیکەکاندا تراژیدیای کۆمەڵێک خەڵکە یان هی میللەتە نەک هی تاکەکەسێک. بۆ نموونە لای ئۆریپید Euripides لە "ئەفیژێنی لە ئۆلیس" کێشەی شانۆنامەکە پەیوەندیی بە بەرژەوەندی و شەرەفی گشت یۆنانەوە هەیە، یان لە ئۆدیپۆس بە پاشایی، شاکارەکەی سۆفۆکلیس، پەیوەندیی بە نەفرەتێکی یەزدانییەوە هەیە کە گشت خەڵکەکەی خستووەتە گێژاوێکەوە. یان شانۆنامەی پارسی ئەسکیلۆس پەیوەندیی بە شکۆداری و بەرگریی گشت نەتەوەیەکەوە هەیە.

هەروەها چیرۆکی کاوەی ئاسنگەری خۆمان کە پەیوەندی بە تراژیدیای یەک میللەتەوە هەیە، لەم بارەوە، خاسیەتێکی کلاسیکی ئەوروپیی هەیە. ئەمەش بەپێچەوانەی (خەج و سیامەند) کە خاسیەتێکی رۆمانسیی هەیە، چونکە باس لە تراژیدیای «تاکە کەس» دەکات.



**سانت سیمۆن**

فەیلەسووفی سوودخوازی

### ٩ - نەزاکەتی ئەدەبی

توخمە پێکهێنەکانی جوانی لە بەرهەمی کلاسیکدا (واتە هەموو ئەو شتانەی کە جوانن) پێویستە هارمۆنییەتییان هەبێت لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا. واتە لە دوو ئاستدا:

یەکەم: هەر دانەیەک لە توخمە پێکهێنەکانی جوانی لە بەرهەمی کلاسیکدا (واتە هەموو ئەو شتانەی کە

جوانن) پێویستە هارمۆنیەتییان لەگەڵ یەکتر هەبێت. ڕەنگێک لەگەڵ ڕەنگێکی دیکەدا، بۆ نموونە لە تابلۆدا، فیگەرێک لەگەڵ فیگەرێکی دیکەدا. یان لە شانۆنامەدا، پاڵەوان لەگەڵ ڕووداوەکەدا، ڕیتم لەگەڵ ناوەرۆکدا.

دووەم: بەرهەمە هونەرییەکە، بە سەرجەم توخمە پێکهێنەکانی خۆیەوە، پێویستە لەگەڵ سروشتی میللەت و دابونەریتەکانمان بگونجێن. پێویستە هارمۆنیەتێکی ئەخلاقی هەبێت و بە نەزاکەتێکەوە بخرێنە ڕوو.

لەبەرچاوگرتنی ئەم گونجانە لای کلاسیکەکان، ناوی لێ نراوە" نەزاکەتی ئەدەبی". ئەمەش لە ڕەخنەسازیی هاوچەرخدا بە هارمۆنی ناوزەدکراوە. ئەمەش لەبەرئەوەی پێویستە هاوئاهەنگی و هارمۆنیەت لە نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی بەرهەمی هونەریدا هەبێ، هەروەها لە هەمان کاتدا هاوئاهەنگی لە نێوان ئەو بەرهەمە و ڕۆحییەتی جەماوەردا، واتە لە نێوان تێکست و خوێنەردا. لایەنی ئەخلاقی و ڕەفتاری پاڵەوانەکان پێویستە لەگەڵ عادەتی گشتیی خەڵک پێکەڵپێک بنەوە.

ئەم یاسایە هەم ئەرستۆ و هەم هۆراس باسیان لێوە کردووە. کلاسیکەکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە پێویستە خۆیان لە بەیانکردنی ڕووداوی دژ بە ئەخلاق و پیشاندانی هەر دیمەنێکی دزێو و ناڕەحەت بەدوور ڕابگرن. ئەمە پێی دەگوترێ (هارمۆنییەت) یان (نەزاکەتی ئەدەبی)

بەم شێوەیە دەبینین، ئەم یاسایەش هەر لە خزمەتی فەلسەفەی عەقڵانی و چینی ئەرستۆکراتدا خۆی دەدۆزێتەوە.

سەدەی ١٧ی کلاسیزم دنیای دەرەوەی پیشان دەدا، مرۆڤ پێوەرێک نەبوو بۆ شتەکان. هەر لێرەشەوە، لاساییکردنەوەی سروشت و ئاراستەی عەقڵ و خۆگونجاندن و لەسەر نیزام ڕۆیشتن باو بوو. ئەمەش



**دیکارت**

«من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم..

بەپێچەوانەی هونەری سەردەمی نوێیە کە لەسەر بنچینەی ناکۆکی و ناتەبایی دامەزراوە.

شکسپیر بەپێچەوانەی کلاسیکەکان کۆمەڵ بە ماقووڵ نابینێ، بەڵکو زیاتر وای دەبینێ کە کۆمەڵ مرۆڤی داگیرکردووە و بچووکی کردووەتەوە، واتە بە لۆژیکی سەردەمی ڕێنسانس دەڕوانێتە شتەکان.

لە تراژیدیای فەرەنسیدا، کۆمەڵ، بۆ نموونە لای کۆرنێ، لە ڕێگەی ئەو تەباییەوە سەیری دەکرێ کە لە نێوان تاکەکەس و کۆمەڵدا هەیە. تاکەکەس لای کۆرنێ سروشتێکی نێگەتیڤانەی ئازارچێژی هەیە: تەنیا ئەوەندەی دەوێ کە خۆی لە دەست داخوازییە نالەبارەکانی کۆمەڵگە دڵڕەقەکەی خۆی بپارێزێت و بەس. بەڵام شکسپیر -لە ڕێگەی پاڵەوانی ڕێنسانسییەوە - ڕەخنە لەم تەباییە و لەم داگیرکردنەی تاکەکەس بەدەست کۆمەڵەوە دەگرێ. تاکەکەس سروشتێکی پۆزەتیڤی هەیە: دەیەوێ بەپێی پێوەرەکانی خۆی، بام تاکەکەسانەش بێت، دەوروبەری خۆی بگۆڕێت.


پەیکەرێکی **کلاسیک**

### ١٠- قانوونی سێ یەکێتییەکان

مەبەست لە قانوونی سێ یەکێتییەکان: یەکەی بابەت، یەکەی کات، یەکەی شوێن؛ کە بە یاسا سەرەکییەکانی ڕێبازی کلاسیزم دەژمێردرێن و میراتی ئەدەبیاتی یۆنانین و لە ئەرستۆوە بۆ کلاسیکەکان ماونەتەوە.

یەکێتیی بابەت: بریتییە لەوەی کە ڕووداوی لابەلا و زیاد و پەراوێزی تێکەڵ بە ڕووداوی بنچینەیی نەبن. بابەتەکە یەک بابەت بێت و سەربەخۆیی خۆی هەبێ.

ئەم یاسایە ئەرستۆ لە لە هونەری شیعردا باسی کردووە، دەڵێ: «هەڵبژاردنی یەک تاقە کەس لە شانۆنامەیەکدا واتای ئەوە ناگەیەنێ کە ئیتر تێکستەکە یەکێتیی بابەتی خۆی دەپارێزێ، چونکە دەکرێ هەزار و یەک ڕووداو لەو تاقە کەسە بئاڵێن». پاشان دەڵێ:

''ئەفسانە یا چیرۆک پێویستە تەنیا یەک بابەت بەیان بکا، هەرچی بەشێکی کە پەیوەندییان بەو بابەتەوە هەیە پێویستە بە شێوەیەکی یەکانگیر یەکەیەکی یەکگرتووی ئەوتۆ پێک بهێنن کە نەتوانرێت هیچ بەشێکی بچووکی ئەو یەکەیە لابیردرێ''.

ئەم یاسایەی ئەرستۆ لە چارەگی یەکەمی سەدەی ١٧مدا دەمەقاڵێیەکی زۆری لەسەر کرا، کلاسیکەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی کە هەر تێکستێکی شانۆیی پێویستە تەنیا باسی ژیانی یەک پاڵەوان بکات و بەس. لە ساڵی ١٦٦٠دا کۆرنێی فەرەنسی چەند بیروڕایەکی تایبەتیی خۆی خستە سەر ئەم یاسایەی ئەرستۆ و لە بەرهەمە شانۆییەکانی خۆیشیدا پەیڕەوی کردن.

یەکێتیی کات: ئەمەش هەر میراتی ئەرستۆیە؛ دەڵێ:'' تراژیدیا هەوڵ دەدا تا پێی دەکرێ خۆی لە شەو و ڕۆژێکدا بئاخنێت و لەو سنوورە تێنەپەڕێنێ''. چونکە گێڕانەوەی ساڵ و دە ساڵ و پەنجا ساڵ لە یەک شانۆنامە یا لە چیرۆکێکدا جێی نابێتەوە و دوورە لە ''لە ڕاست چوون''.

تا نیوەی یەکەمی سەدەی ١٦ ماوەی ڕووداوەکانی شانۆگەری نەدەبووایە لە یەک ڕۆژ زیاتر بێت. لە نیوەی دووەمەوە کەمتر بووەوە و بووە دوازدە کاتژمێر.

یەکێتیی شوێن: ئەرستۆ لەم بارەیەوە هیچی نە وتووە؛ لە ساڵی ١٤٥٥دا ماگی Maggi ڕەخنەگری ئیتاڵی باسی کردووە: «ماوەی نواندن ئەگەر کورت بێت و شوێنەکانیشی جۆراوجۆر و دوور لە یەکتر، ئەوا تراژیدیاکە سروشتی بوونی خۆی لەدەست دەدات. بۆیە ڕووداو پێویستە تا لە توانادایە لە یەک شوێندا ڕووبدات».


لافۆنتێن

تراژیدیا لەو کاتەدا دەتوانێ کاریگەر بێت کە کۆ و پوختە کرابێتەوە و پەرتەوازە نەبێت. تەنانەت لە ساڵی ١٦٣٥ نووسەرێکی کلاسیک بە ناوی شاپلن وتی: ''لە سەرتاسەری شانۆنامەیەکدا پێویست بە لابردنی دیکۆر

و دانانی هیچ دیکۆرێکی دیکە ناکا". لەساڵی ١٦٦٠ بەملاوە پەیڕەوکردنی ئەم سێ قانوونە بووە یاسایەکی کلاسیکیی چەسپاو.

چوارەمین یەکــە: هۆراس لە ســەرەتای هونەری شیعرەکەی خۆیدا یەکێتیی ئیقاعیشی Ton خستووەتە سەریان. واتە لە سەرتاسەری بەرهەمەکەدا پێویستە تەنیا یەک ئاواز، یەک ئیقاع بەکاربهێنرێت، لەو کاتەشدا بەرهەمێکی تێکەڵی تراژیدی و کۆمیدی دەردەچێت و چیتر بە کارێکی کلاسیک ناژمێردرێ.

## ژانرە ئەدەبییەکانی کلاسیزم

ژانرە ئەدەبییەکانی کلاسیزم، هەندێکیان، لەگەڵ کۆتایی هاتنی کلاسیزم، ئەوانیش کۆتاییان پێ دێت. ژانری دیکە جێگەیان دەگرنەوە کە پێشتر لای کلاسیکەکان نەبوون. ئەمەش تیۆرێکە ژۆرژ لۆکاش لە کتێبی (ڕۆمان وەک داستانێکی بۆرژوازی) هەروەها پاشتر ڕەخنەگری فەرەنسی، تۆدۆرۆف، بەڕاستیان سەلماند: لە هەر سەردەمێکدا هەندێ ژانری کۆن کۆتاییان پێ دێت و هەندێ ژانری تازە سەرهەڵدەدەن.



کۆرنێی

ژانرە ئەدەبییەکانی کلاسیزم، وەک چینە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە، چەند جۆرێکن:

١- داستان: دەرکەوتنی بێ هاوتای ئێلیادە Iliada لە ڕیزی شاکارەکانی داستاندا بووە نموونەیەک کە هەموو نووسەرە کلاسیکەکان لاسایی بکەنەوە.

خاسیەتەکانی داستان: جەنگ و شکۆمەندیی بابەتەکە و ئازایەتیی پاڵەوانەکەیەتی، هەروەها ئەوین بە مەرجێک کە گەورە بێت.

پاڵەوانەکانی داستان، پێویستە تەنانەت هەنگاوەکانیشیان خاڵی نەبن لە کاریگەرێتیی پاڵەوانانە.

٢- ڕۆمان: داستان کاتێ لە جیاتی شیعر بە پەخشان بەیان دەکرێت، ناوی لێ دەنرێت "ڕۆمان"، کە ئەمەش ژانرێکی ئەدەبیی دیکەیە.

جیاوازیی ڕۆمان و داستان لەوەدایە کە بابەت لە ڕۆماندا ئەوینە و لە داستاندا جەنگە. ڕۆمان بە پەخشانە و داستان بە شیعرە. لە ڕۆماندا بایەخ زیاتر دراوەتە "لە ڕاستچوون". لە ڕۆماندا پێویستە سەرەنجامێکی ئەخلاقی بەدەستەوە بدرێ.

جێی سەرنجە کە نووسەرانی کلاسیک کەمیان کەوتنە بیری ڕۆمان نووسین.

٣- تراژیدیا: بۆ تراژیدیا دەبێ بگەڕێینەوە لای ئەرستۆ، چونکە تۆژەر و نووسەران پەیڕەوی بیروڕاکانی ئەویان کردووە لەبارەی تراژیدیا. ئەرستۆ لە هونەری شیعرەکەیدا بەم جۆرە پێناسەی تراژیدیا دەکا: " تراژیدیا بریتییە لە لاساییکردنەوەی ڕووداوێکی گەورەی نزیک لە ڕاستی، ئەمەش بە دەربڕینێکی ناسک. جوانیی ئەم دەربڕینەش پێویستە لە شێوەی شانۆنامەیەک یا لە شێوەی چیرۆک و داستانێکدا بێت و لە هەموو بەشەکاندا وەک یەک ڕەنگ بداتەوە.

«نووسەر لە نووسینی تراژیدیادا سوود لە ترس و بەزەییی دەبینێت و هەست و سۆزی مرۆڤ پاک دەکاتەوە». ئەم پێناسەیە، دوای ئەرستۆ ڕووبەڕووی گفتوگۆیەکی زۆر بووەوە و بە سەدان شێوەی جیاواز لێک درایەوە.

لە بارەی ڕووداوی تراژیدیا هەموو خاوەنڕایان ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی کە پێویستە ڕووداوەکە لە ئەفسانە یا لە مێژوو وەرگیرابێ. بەشی هەرە زۆری شاعیرانی کلاسیک ڕایان وایە کە ڕووداوەکە پێویستە لە ئەفسانە و مێژووی کۆنی ڕۆم و یۆنانی وەربگیرێ، واتە ڕووداوی تازە و هاوچەرخ نابێ بخرێتە ناو چیرۆکی تراژیدیا.

ئەرستۆ دەڵێ: پاڵەوانی تراژیدیا نابێ کەسێکی تاوانبار بێ، هەروەها ناشبێ زۆر خواپەرست و کارڕاست بێ. پێویستە "لە بەختەوەریی خۆیدا تووشی چەرمەسەرییەک هاتبێ، ئەمەش نەک لەبەرئەوەی تاوانێکی کردبێ، بەڵکو ئەم چەرمەسەرییە ئەنجامی هەڵەیەک بێ ".

پاڵەوانی تراژیدیا" بە ڕای ئەرستۆ "دەبێ بتترسێنی یان وات لێ بکات کە بەزەییت پێیدا بێتەوە". ئەمەش خاڵێکە هەموو خاوەنڕایانی کلاسیک لەسەری ڕێک کەوتوون.

هەروەها خاوەنڕایانی کلاسیک دەڵێن: ماوەی تراژیدیا دەبێ نزیکەی سێ سەعات، ژمارەی بەیتەکانیشی: هەزار و پێنج سەد تا هەزار و شەش سەد بەیت، ژمارەی پەردەکانیشی: پێنج پەردە بێت.

٤- کۆمێدیا: تیۆری کۆمێدیا زۆر کورتە. ئەرستۆ هیچی ئەوتۆی لە بارەوە نەگوتووە، بەڵام خاوەنڕایانی کلاسیک دەڵێن: "کۆمێدی بریتییە لە کارێکی نواندنی سەرنجڕاکێش کە کەسایەتییەکان - لەچاو ئەوانی تراژیدیا - سادەتر و کەمپایە ترن. ڕووداوەکانی لە ژیانی ڕۆژانە وەرگیراون. کۆتاییەکەی پێویستە خۆش بێت و شتێکی تازە بێت". لە بارەی مەسەلەکانی دیکەی کۆمێدیا، هەمان دەستوورەکانی تراژیدی لەگەڵ کۆمێدیاش یەک دەگرنەوە.

٥- شیعری شوانکارەیی Bucolique: شیعری شوانکارەیی ئاوازی سروشت و ئەوین دەردەبڕێ. بایەخی ئەم جۆرە شیعرە سادەیی و ساکاری و ڕەوانی و سروشتی بوونیانە؛ پێویستە لایەنی سەرەتایی و لادێییانەی خۆی لە دەست نەدات.

٦- شیعری لیریکLyrique: شیعری لیریک چەندین جۆری هەیە، گرنگترینیان: Ode قەسیدەیە، کە تەرخان کراوە بۆ ستایشکردنی خودا و خواوەندان و وەسفکردنی شەڕ و سەرکەوتنەکان، هەروەها باس و خواسی ئەوین. چەند جۆرێکی دیکەی لیریک: Ballade, Epigramme, Satire جۆرێکن لە شێوەی شیعری هیجایی و پەیوەندییان بە چێژ و خرۆشانی گۆیندەکانیانەوە هەیە.

# پێشەواکانی ڕێنسانس

## ئەو نووسەرانەی بوونە سەرچاوەگەلێک بۆ کلاسیزم

**دانتی** (١٢٦٥ - ١٣٢١)

دانتی، کە ڕۆشنبیرترین کەسی سەردەمەکەی خۆی بوو، یەکەمین موژدەدەری سەردەمی ڕێنسانسە. لە رووی سیاسییەوە سەر بەو ڕێبازە سیاسییانە بوو کە دژی دەسەڵاتدارانی سەردەمەکەی بوون. بۆیەش حوکم درا و لە " ڕاڤنا" بە ئاوارەیی و دوور لە نیشتیمان مرد.

دانتی بایەخێکی زۆری بە زمان و لێکۆڵینەوە لە زمانی نەتەوەیی دەدا، داخوازیی ئەوەی کرد کە زمانی نەتەوەیی (ئیتالی) لە جیاتی لاتینی لە نووسیندا بەکاربێت. بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیشی، زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی بۆ زمانی ئیتالی دروست کرد.

دانتی لە کتێبەکانیدا بانگهێشتی خەڵکی دەکرد بۆ خۆشویستنی گەل و نیشتیمان، هەروەها بۆ ڕەوشتی بەرز و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کۆمەڵانی خەڵک. هیوا و گەشبینییەکی زۆر لە بەرهەمەکانی دانتیدا بەدی دەکرێ.

بەرهەمەکانی: " لە بارەی زمانی زارەکییەوە"، "ژیانی نوێ" کە کۆمەڵە شیعرێک و چەند چیرۆک و چەند پارچە پەخشانێک بوو. هەروەها شاکارەکەیشی بریتیە لە " کۆمێدیای یەزدانی" کە لە ١٣٠٧ نووسراوە و بریتییە لە هەزار سروود و نزیکەی ١٤ هەزار بەیت. ئەم شاکارە فەرهەنگی زمانی ئیتالیی زۆر دەوڵەمەند کرد. ناوەڕۆکی ئەم شاکارە پڕیەتی لە پەندی میللی و بیروڕای کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفیی جۆراوجۆر کە بەگژداچوونێکی توند و چاونەترسانەیان تێدایە دژی یاسای دەسەڵاتداران و نەریتی کۆن.

کۆمێدیای یەزدانی بەیتە شیعرێکی درێژی خەیاڵییە و نووسەرەکەی بە هۆیەوە دەچێتە ئەو دنیا " قیامەت" کە لە سێ شوێن پێکهاتووە: دۆزەخ، خاوێنگە (ئەو شوێنەی کە خۆتی تێدا پاک دەکەیتەوە)، بەهەشت. دانتی لەم گەشتەیدا شاعیری بتپەرستی ڕۆمانی دەکاتە ڕێ نیشاندەری خۆی بەرەو بەهەشت. کۆمێدیای یەزدانی چیرۆکێکی خەیاڵیی پڕ لە کارەسات و ڕووداوی سەیر و سەمەرەیە، ڕەخنەگرانە، ژیان و واقیعیی ناهەمواری ئیتاڵیامان نیشان دەدا.

**پێترارک** (١٣٠٤ - ١٣٧٤)

پێترارک لە سەرەتادا سەرقاڵی ژیانی کەنیسە دەبێ، پاشان دڵبەستەی کولتووری کۆن بوو و ڕووی کردە زمانی لاتینی. گرنگترین کارێک کە ئەو کردی و هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان کرد: کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی دەستنووسە کۆنە جۆراوجۆرەکان بوو. پێترارک لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا ڕەخنەگرێکی دڵسۆزی کۆمەڵەکەی خۆی بوو. شیعریشی دەنووسی و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەلسەفیشی دەنووسی.

بەرهەمەکانی: "گیانی بەرز" کە باس لە ڕاپەڕینەکەی ڕۆما دەکا؛ "ئیتالیای نیشتمانم" کە بانگ بۆ یەکێتیی ئیتالیا هەڵدەدا؛ "ئەفریقا" کە گیانێکی نیشتیمانپەروەرانەی تێدا بەیان کراوە؛ "نامە بێ ناونیشانەکان" ڕەخنە لە لایەنە خراپەکانی کڵێسا دەگرێ.

**بۆکاچیۆ** (١٣١٣ - ١٣٧٥)

بۆکاچیۆ هاوڕێی پێترارک بوو، بۆیە لە سەرەتای ژیانیدا بەرەو لێکۆڵینەوە لە زانستی دین ڕۆیشت. پاشان کەوتە ژێر کاریگەرێتیی نووسەرانی گریکی وەکو هۆمێرۆس و پلاتۆن. بیرکردنەوەی بۆکاچیۆ سیمایەکی نەتەوەیی و دیموکراسی و نیشتیمانپەروەرانەی هەبوو؛ دەیویست هەمان پەیامی دانتی و پێترارک بگەیەنێتە جێ.

شاکاری ئەو بریتییە لە چیرۆکی "دی کامێرۆن" کە بریتییە لە سەد چیرۆکی کورت، چیرۆکەکان لەسەر زمانی حەوت کچ و سێ کوڕ دەگێڕدرێنەوە کە لە کاتی ڕشانەوەکەی ساڵی ١٣٤٨دا فلۆرەنسا جێدێڵن و لە ڤێللایەکی دەرەوەی شاردا دە شەو و دە ڕۆژ دەمێننەوە. هەر یەکەیان ڕۆژی چیرۆکێک دەگێڕێتەوە. دیکامێرۆن بە لاتینی واتە " یاداشتی دە ڕۆژە". چیرۆکەکان ڕەخنەگرانە باسی واقیع و ژیانی ناهەموار و پڕ چەرمەسەریی ئیتاڵیا دەکەن بەشێوازێکی فۆلکلۆری، هەر چیرۆکێک پەردە لەسەر لایەنێکی دەستنیشانکراوی خراپی ئیتاڵیا هەڵدەداتەوە: کەنیسە و پیاوانی کەنیسە، ئاغا و جۆتیاران، بازرگانە ساختەچی و جەردەکان، دەسەڵاتدارە مشەخۆر و دزەکان.

**بوالۆ** (١٦٣٦- ١٧١١)

لە ساڵی ١٦٧٤دا ڕەخنەگری فەرەنسی، نیکۆڵا بوالۆ Nicolas BOILEAU کتێبی (هونەری شیعر Art Poethique )ی بڵاوکردەوە و دەستوور و بنەماکانی کلاسیزمی بەشێوەیەکی تیۆری تێدا شی کردەوە و چەسپاند؛ توانی گیانێکی هاوچەرخانە بە ڕێبازەکە بدات و کتێبەکەی خۆیشی وەک سەرچاوەیەکی گرنگی دیکەی کلاسیزم پێشکەش بکات.

بوالۆ بەرهەمەکانی مولیێری زۆر خۆش دەویست و ڕیزێکی زۆری لێ دەنان. لە کۆشکی لویسی ١٤م کاری دەکرد و لە ١٦٨٣ بووە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا؛ ببووە ڕەمزی ڕۆشنبیریی سەردەمی لویسی ١٤م.

بوالۆ، کتێبەکەی دەکرێ بە ٤ بەش. لەو کتێبەیدا باسی بنەما بنچینەییەکانی داهێنانی شیعر دەکات، پاشان جۆرەکانی ئەدەب دەستنیشان دەکات (شیعری لیریک، هیجائی، کۆمێدی، غەزەل، تراژیدیا، کۆمێدیا و داستان).

بوالۆ، لە بواری تراژیدیادا ڕاسین بە نموونەیەکی بەرزی دراما و تراژیدیا دەزانێ؛ لە بواری کۆمێدیاشدا شاعیری لاتینی تێرانس TERANCE کە لە سەدەکانی پێش زایین ژیاوە بە نموونەیەکی سەرکەوتوو دەزانێ.

بوالۆ ئامۆژگاریی نووسەران دەکات: "لە سەرەتادا بیربکەنەوە ئنجا دەست بکەن بە نووسین"، هۆشیاریان دەکاتەوە کە بە دوای ژیانی خۆش و پارەدا نەکەون. هەروەها بوالۆ جەخت دەکاتە سەر ڕۆڵی هۆش و دەڵێ: "با هەمیشە بەتەنگ هۆشەوە بن، با تەنها لەوەوە هەرچی جوانی هەیە وەری بگرن".

زمانی شیعر لای بوالۆ پێویستە زمانێکی قورس و سنعەتکارانە بێت، بەم شێوەیە سروشتێکی ئورستۆکراتیانەی هەیە و خەڵکی عەوام لێی تێ ناگات. بوالۆ کاتێ لە ١٦٧٤ هونەری شیعری نووسی، شاعیری ئینگلیز جۆن ئۆلدهام تەرجەمەی ئینگلیزیی کرد و کاری کردە سەر درایدن Dryden ١٦٣١- ١٧٠٠ و ئەلکزاندەر پۆپ ١٦٨٨- ١٧٤٤.

هەروەها بەرهەمی ئەم هونەرمەند و نووسەرە پێشەنگانەش لە سەردەمی ڕێنسانس و ڕۆشنگەریدا بوونە سەرچاوەگەلێکی بناغەیی بۆ فراژووبوونی کلاسیزم. بەرهەمەکانیان بە شاکارەکانی کلاسیزم دەژمێردرێت:

**لیۆناردۆ داڤنشی** (١٤٥٢ - ١٥١٩) پەیکەرتاش و نیگارکێش و نووسەری ئیتاڵی.

**ئارازمسی رۆتەردامی** (١٤٦٦ - ١٥٣٦) زمانەوان و زانا و رووناکبیر.

**ماکیاڤێللی** (١٤٦٩ - ١٥٢٧) سیاسی و مێژوونووسی ئیتاڵی. ناودارترین بەرهەمەکانی: «میر» کە کراوەتە کوردی.

**میکائێل ئەنژێلۆ** (١٤٧٥ - ١٥٦٤)، پەیکەرتاش و ئەندازیاری ئیتاڵی.

**سێرڤانتس** ١٥٤٧- ١٦١٦، رۆمانووسی ئیتاڵی. ناودارترین بەرهەمەکانی: دۆن کیشۆت کە دوو جاران تەرجەمەی کوردی کراوە.

**شکسپیر** (١٥٦٤ - ١٦١٦) شانۆنامەنووسی ئینگلیز. ناودارترین بەرهەمەکانی: هاملێت، ئۆتێللۆ، ماکبێس، شا لیر.. کە تەرجەمەی کوردی کراون.

**دیکارت** ١٥٩٦- ١٦٥٠ تیۆری رێژەیی بۆ جوانی هێنایە ئارا: جوانی، لە هەر وڵاتێک و لای هەر کەسێک چەمکی خۆی هەیە. فەلسەفەی دیکارت یارمەتیی چەسپاندنی کلاسیزمی دا.

**پیێر کۆرنێی** ١٦٠٦- ١٦٨٤ ناودارترین شانۆنامەنووسی (تراژیدیانووسی) کلاسیزمی فەرەنسییە. گرنگترین بەرهەمەکانی: (هۆراس) لە ساڵی١٦٤٠دا نووسیوە.

کۆرنێی هەموو خاسیەتەکانی کلاسیزمی بەوپەڕی وردبینییەوە بەکاردەهێنا: عیبرەتی ئەخلاقی بەشێوەیەکی چێژبەخش، لاساییکردنەوەی نووسەرانی پێشوو، وەسفی چاکە و خراپە، هەڵبژاردنی پاڵەوانەکانی ڕابردوو، مێژوو کردنە کەرەستەکردن بۆ کارکردنە سەر ئەمرۆ، پیشاندانی شانۆنامە لە تەنیا پێنج پەردەدا، بەکارهێنانی بەحری ئەسکەندەری (بەیتی قافیەداری دووازدە هیجایی) کە وەک عەرووزی فەراهیدی - عەرەبی چەندین سەدە بوو باو بوو.

**جۆن میلتۆن** ١٦٠٨- ١٦٧٤ شاعیری گەورەی ئینگلیز، لە کۆتایی ژیانیدا کوێر بوو. خاوەن کتێبی ناوداری «بەهەشتی ونبوو».

**لافۆنتێن** ١٦٢١- ١٦٩٥، نووسەری ناوداری فەرەنسا، کە وای بە باشتر دەزانی شیعری چیرۆک ئامێز و ئەفسانە تەمسیلییەکان بنووسێت.

**مۆلییێر** ١٦٢٢- ١٦٧٣ گەورەترین کلاسیکی فەرەنسایە لە بواری کۆمیدیانووسیندا. بە بۆچوونی ئەو: تراژیدیا وێنەی نەجیبزادە و پاڵەوانەکان، بەڵام کۆمێدیا وێنەی خەڵکی ئاسایی دەکێشێ.

**جۆن لۆک** ١٦٣٢- ١٧٠٤ دامەزرێنی رۆشنگەری لە بەریتانیا. ئەوەی سەلماند کە مرۆڤ هەر بە غەریزە بیروبۆچوون و شەڕ یان خێری لەگەڵ خۆی هەڵنەگرتووە. هەموو شتێکی گەڕاندەوە بۆ ژینگە و ئەزموونەکان: «مرۆڤ خۆی بەرپرسی یەکەمە لە ئاسوودەبوون یان بەدبەختبوونی مرۆڤ».

**ژان ڕاسین** (١٦٣٩ - ١٦٩٩) تراژیدیانوسێکی گەورەی کلاسیزمی فەرەنسییە. ناودارترین بەرهەمەکانی:

ئەسکەندەری گەورە، لە ١٦٦٥. ئەندرۆماک، لە ١٦٦٧. میتریدات، لە ١٦٧٣. بایەزید، لە ١٦٧٣ کە تاقە تراژیدیایەکی کلاسیکە باسی ژیانی هاوچەرخ، باسی سوڵتانە عوسمانییەکانی ئەوسەردەمە دەکات. ئاتالی، لە ١٦٩١.

**دانیال دیفۆ** ١٦٦١- ١٧٣١ نووسەری ڕۆمانی ڕۆبنسۆن کرۆسۆ.

**جۆرج بێرکلای** ١٦٨٥- ١٧٥٣ فەیلەسووفی ئینگلیز.

**مۆنتسیکیۆ** ١٦٨٩- ١٧٥٥، فەیلەسووفی فەرەنسی، خاوەنی «نامە ئێرانییەکان »لە ١٧٢١، کاریگەرترین بەرهەم دژی سیستەمی دەسەڵاتی سەدەی هەژدەم: «ئێمە دەمانەوێت دابونەریت و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیی خۆرئاوا بەئاگا بێنین». پاشان کتێبی «ڕۆحی یاساکان»ی نووسی لە ١٧٤٨دا کە کراوەتە کوردی.

هەروەها **دیڤید هیووم** ١٧١١- ١٧٧٦ فەیلەسووفی ناوداری ئینگلستان، لەگەڵ دیدرۆ ١٧١٣- ١٧٨٤ فەیلەسووفی ناوداری فەرەنسا و دەیان ناوی درەوشاوەی دیکە کە هەندێکیان زەمینەیان خۆش کرد بۆ سەرهەڵدانی ڕێبازی رۆمانسیزم.

## چەند تێبینییەکی گشتی لەبارەی ئەدەبیاتی کلاسیکی میللەتان

کلاسیزم لە ئەدەبی فەرەنسیدا هەر لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەوە دەبینرێت. هەندێک ڕەخنەگر کلاسیزمی فەرەنسی دابەش دەکەنە سەر دوو قۆناغ. قۆناغی یەکەم: لە ١٦٣٠- ١٦٦٠ کە قۆناغی خۆئامادەکردنی تیۆری و بۆچوونەکانە کە کۆرنێ گەڵاڵەی کرد و چەند شانۆنامەیەکی تێدا بڵاوکردەوە. دووەم قۆناغیش: لە ١٦٦٠ تا ١٦٨٨ کە تێیدا ڕاسین و مۆلییێر سەرهەڵدەدەن.

فەیلەسووفی ڕۆشنگەری فەرەنسا، ڤۆڵتێر ١٦٩٤- ١٧٧٨، لە «نامە فەلسەفییەکان» لە ١٧٧٣دا دەڵێ: «من لە ڕێگەی سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی بەریتانیاوە هێرشم کردە سەر سیستەمی فەرەنسی و خاڵە لاوازەکانی و بێ دادییە فەرەنسییەکان. لێبوردنی ئایینی، ئازادیخوازی لە سیاسەت و بازرگانیدا، پایەبڵندیی زانست و فەلسەفە.. لە بەریتانیادا سەرنجی منیان ڕاکێشابوو».

ئەم قسەیەی ڤۆڵتێر ئەوە دەردەخات کە کلاسیزمی فەرەنسی لە کلاسیزمی ئینگلیزەوە ئاوی خواردووەتەوە. بەڵام ڕاستییەکەی، فەرەنسییەکان، لە بنیاتنانی ئەو دەستوورانەی کە بۆ کلاسیزمی خۆیان دایاننابوو، قەرزاری ئیتاڵییەکانن، چونکە لە ئەوانیان وەرگرتبوو. ئیتاڵییەکان نزیکەی سەد ساڵ پێش فەرەنسییەکان ئەم دەستوورە کلاسیکیانەیان بۆ خۆیان دامەزراندبوو. سەرچاوەی هەرە گرنگی ئەم دەستوورانەش هونەری شیعری ئەرستۆ بوو کە لە ساڵی ١٤٩٨ تەرجەمە کرابووە سەر زمانی لاتینی و ئیتاڵی.

کلاسیزم لە سەدەی هەژدەمدا لە ئیتاڵیا گەیشتە ئەوپەڕی پلەی درەوشانەوە. لە بواری شانۆگەریدا: کۆمێدیانووسی ئیتاڵی، گۆلدۆنی Goldoni (١٧٠٧-١٧٨٣)، هەروەها تراژیدینووس، ئەلفیێری Alfieri (١٧٤٩- ١٨٠٣) ڕۆڵی دیاریان هەبوو.

ئەدەبیاتی ئەڵمانی کە لە سەدەی شانزەمدا لەژێر کاریگەریتی گۆڕانێکی گەورەدا بوو، لە سەردەمی ڕێنسانسدا هیچ بەرهەمێکی کلاسیکیی ئەوتۆی بەدەستەوە نەدا؛ تەنیا لە سەدەی حەڤدەم بەملاوە بوو کە ئەدەبیاتی ئەڵمانی توانی بگاتە شانی کلاسیک و لەگەڵ کلاسیزمی فەرەنسی و ئیتاڵی هاوئاهەنگ بکەوێتەوە. ئەمەش لە شێوەی

لاساییکردنەوەیەکی لاواز و کزدا. لە شاعیرانی ئەڵمانیای سەدەی حەڤدەمدا، تەنیا ناوی ئۆپیتز Opitze (١٦٣٩- ١٦٩٤) سەرنجمان ڕادەکێشێ کە خاوەنبیرێکی گەورەیە و لە بواری چارەسەرکردنی کێشەکانی زمانی ئەڵمانیدا کاری زۆر گەورەی ئەنجام داوە. قۆناغی درەوشاوەی ئەدەبیاتی کلاسیکی ئەڵمانیا لە سەدەی هەژدەمەوە دەست پێدەکا، لەگەڵ قۆناغی لیسینگ Leesing (١٧٢٩-١٧٨١)، کە نووسەر و ڕەخنەگر و شانۆنامەنووسێکی مەزنی ئەڵمانییە.

کلاسیزم لە ئینگلستان لە سەدەی حەڤدەم بەملاوە سەری هەڵدا. دیارترین نووسەرانی ڕێبازی کلاسیزم لە شیعردا: میلتۆن Milton (١٦٠٨- ١٦٧٤)، لە شانۆگەریدا: درایدن Dryden (١٦٣١- ١٧٠٠) و باکۆن Bacon (١٥٦١- ١٦٥٩) بوون.

کاتێ ئەدەبیاتی کلاسیک لە سەدەی شانزدەم و حەڤدەمدا لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپادا بڵاودەبێتەوە، ئەدەبیات لە ئینگلستاندا هێشتا هەر لەژێر تەئسیری ڕێنسانس دایە و کەم پەیڕەوی دەستوورەکانی کلاسیزم دەکا. نووسەرانی ئینگلیز بەشێوەیەکی گشتی زۆر کەم چوونە ژێر باری یاسا و دەستوورەکانی کلاسیزم، بەرهەمەکانیان خاوەن قانوون و خەسڵەتی تایبەتی ناوەوەی خۆیانن. ئەم بێ دەروەستییەش - لەوساوە - وای کرد کە ڕێگا خۆش بێ بۆ ئەوەی لە جیاتی کلاسیزم ڕۆمانسییەتێکی بێ بەند و بار پەیدا بێ. چونکە نووسەرە ئینگلیزەکان قانوون و دەستوورەکانی کلاسیزمیان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ڕەچاونەدەکرد، بەرهەمەکانیان، وەک بەرهەمەکانی شکسپیر، شێوە و ڕێسا و خەسڵەتێکی تایبەتی خۆیان هەبوو.

# وشەی کۆتایی

کلاسیزم چەندین سەدە لە ئەورووپادا درێژەی کێشا. فەلسەفەی عەقلانییەتی کلاسیزم لە خزمەتی چینی ئەرستۆکراتیدا بوو. چینە بەرزەکان تیۆری کلاسیزمیان بەکاردەهێنا بۆ هێشتنەوە و چەسپاندنی دەستوور و قانوونە باوەکان، هەروەها بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان. ئەمە لەکاتێکدا بارودۆخی شارستانیی ئەورووپا گۆڕانی بەسەردا دەهات، هەروەها چێژ و بینین و بیروڕاکانی مرۆڤ و کۆمەڵیش وردە وردە دەگۆڕان، بۆیە نووسەران لە کۆتاییدا لەم ڕێبازە بێزار بوون؛ گەیشتنە ئەو ڕایەی کە کلاسیزم تەنیا بەرهەمی عەقڵە، عەقڵیش سنوور بۆ سۆز و خەون و دەربڕینەکانی مرۆڤ دادەنێت، لەگەڵ خەم و ئاواتەکانی مرۆڤی سەردەمی تازە ناگونجێت، بۆیە هەوڵیان دەدا کە لە چوارچێوەی ئەو ڕێبازە عەقڵانییە وشکە دەرباز بن؛ شێوە و تەکنیک و شێوازی دیکەی دەربڕین بدۆزنەوە.

# بەراوردێکی کلاسیزمی ئەورووپی و کلاسیزمی کوردی

بۆ ئاسانکردنەوەی بابەتەکە و لە چوارچێوەگرتنی ئەکادیمییانەی کەرەستەکانی مێژووی ئەدەبیاتی کۆنمان، کارێکی تازە ناکەین ئەگەر ئێمەی کورد لە چوارچێوەی ئەدەبیاتی خۆماندا، ناو لە قۆناغ و بەرهەمەکانی باباتاهیری هەمەدانی (٩٣٥- ١٠١٠) و ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٧) و نالی (١٧٩٧- ١٨٥٥) بنێین «قۆناغی کلاسیک».. وەک چۆن ئەورووپاییەکانیش ناو لە سەرجەم چەند سەد ساڵێکی ئەدەبیاتی خۆیان دەنێن «کلاسیک».

ئەکادیمییە ئەورووپاییەکان بە سەرجەم ئەدەبیات و هونەری سەدەکانی ناوەڕاست تا سەرەتای سەدەی نۆزدەم دەڵێن «کلاسیک»، دەشزانن کە فلان نووسەری سەدەی هەژدەم لەچاو فیسار نووسەری سەدەی حەڤدەم گەلێک نوێگەری و دەستاوەردی تازەیشی پێ بووە، بەلاّم سەبارەت بەوەی هەردووکیان لەناو یەک جۆر سیستەمی بیر و ڕێسای نووسیندا کاریان کردووە، هەر لەناو یەک چوارچێوەی گشتیدا دەیانخوێننەوە.

عەرەب و تورک و فارس و زۆربەی نەتەوەکانی دیکەش لەم بوارەدا هەر وایان کردووە. بە هەمان شێوە ئێمەی کوردیش، لەپێناو ئاسانکردنی تێگەیاندن و دۆزینەوەی مێتۆدێکی لەبار بۆ تۆژینەوە و لێکتر حاڵیبوون، واباشترە هەمان پۆلێنی ئەورووپاییەکان و میللەتانی دیکە بەکار بێنین؛ بەلاّم بێگومان بە ڕەچاوکردنی چەند خاڵێک:

- چەمکی کلاسیک، ئەگەر بەکاری بهێنین بۆ ناونانی ئەو ئەدەبیاتەی سەدەکانی یازدەم تا نۆزدەمی کوردی، واتایەکی ئێستاتیکیی ئەوتۆ ناگرێتەوە کە مێتۆد و خاسیەتەکانی هەمان ڕێبازی کلاسیزمی ئەورووپای هەبێت؛ بەڵکو تەنێ وەک ناونانێک دەبێت لەپێناو جیاکردنەوەی قۆناغەکانمان و لێک حاڵیبوونمان. ئەمەش چونکە کلاسیزمی ئەورووپا جیاوازە لە کلاسیزمی کوردی:
- کلاسیزمی کوردی پڕە لە سۆز و دیدی ڕۆمانسیانە و توخمی ڕۆمانسیزم، ئەمەش بەپێچەوانەی کلاسیزمی ئەورووپایی کە لەسەر بنچینەی عەقڵ و عەقڵگەرایی Rationalisme دامەزرابوو.
- کلاسیزمی ئەورووپایی لەسەر بنچینەی فەلسەفەی گریک دامەزرابوو، نووسەرانی کلاسیکی ئەورووپا لاسایی و پەیڕەوی دەستوورەکانی یۆنانییە کۆنەکانیان دەکردەوە (سۆفۆکلیس، هۆمیرۆس، ئەرستۆ، هۆراس..)؛ بەلاّم کلاسیزمی کوردی لاسایی و پەیڕەوی دەستوورەکانی ئیسلامییەکانیان دەکردەوە (المتنبی، المعری، الفراهیدی، فضولی، فردوسی، شیرازی..).
- کلاسیزمی ئەورووپایی چەند سەرچاوەیەکی تیۆری و مێتۆدی و فەلسەفیی هەبوو کە لەسەری دەڕۆیشت (کتێبەکانی هۆراس و ئەرستۆ و بوالۆ..) بەلاّم کلاسیزمی کوردی هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆی نەبوو لە تێکستەکان زیاتر.
- کلاسیزمی ئەورووپایی لاسایی «عەرووزی ئەسکەندەری» و هونەرە ڕەوانبێژییەکانی یۆنانی دەکردەوە ؛ بەلاّم کلاسیزمی کوردی لاسایی عەرووزی فەراهیدی و هونەرە ڕەوانبێژییەکانی عەرەبی دەکردەوە. بۆیەش دەبینین تەکنیک و فۆڕمە ئەدەبییەکانمان هەمان شت نین؛ یان دەبینین کلاسیزمی ئەورووپی یاسای یەکیەتیی بابەتی هەبووە، بەلاّم لە کلاسیزمی کوردیدا نەبووە.
- کلاسیزمی ئەورووپایی زۆر بەرچاو سیمای چینایەتی و مەتحی چینی ئەرستۆکراتیی پێوە دیارە و هەستی

نەتەوەپەروەریی تێدا نابینی؛ بەڵام کلاسیزمی کوردی سیما چینایەتییەکەی کەم تێدا دەبیندرێت و جارجار نەتەوەپەروەریشی تێدا دەردەکەوێت. کلاسیزمی ئەورووپی نەتەوەپەروەر نییە و بە دەگمەن هەستی نەتەوایەتی دەردەبڕێ، بەڵام هی کوردی (بۆ نموونە لای ئەحمەدی خانی و حاجی کۆیی) سەرەتای ناسیونالیزم لایان وەدیار دەکەوێ.

- کلاسیزمی ئەورووپی ئەگەر لە خزمەت چینی دەرەبەگدا بووبێت و نەیتوانیبێت لە چوارچێوەی بەرژەوەندی و دابونەریتەکان دەرچووبێت، ئەوا کلاسیزمی کوردی بە ڕێژەیەکی زۆر کەمتر ئەو خۆ بەستنەوەیەی بە خزمەتکردنی چینی دەرەبەگەوە هەبووە، تەنانەت بۆیەش دەبینین هەندێ لە شاعیرانی کلاسیکی کورد (شێخ ڕەزا، مەولەوی، حاجی، نالی..) ئەو چوارچێوە حەرام و قەدەغەیە یان ئەو هێڵە سوورە دەشکێنن.
- کلاسیزمی ئەورووپایی لەخۆگری ژمارەیەکی زۆر لە ژانرە ئەدەبییەکانە (شانۆنامە، وتار، چیرۆک، ڕۆمان.. هتد)، بەڵام کلاسیزمی کوردی، زۆربەی، تەنێ شیعرە!
- کلاسیزمی کوردی، زۆر زوو، چەند توخم و کەرەستە و بینینێکی ڕۆمانسییانەی تێ دەڕژێ. بۆ نموونە بەرهەمەکانی بێسارانی و مەولەوی و وەلی دێوانە و وەفایی. لە کاتێکدا ئەم دووفاقی و تێکەڵبوونە لە کلاسیزمی ئەورووپیدا نابینین.
- کە کلاسیزمی ئەورووپایی لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا کۆتایی پێ دێت، بەڵام کورد تا کۆتایی سەدەی نۆزدەمیش هەر بەردەوامە.
- کلاسیزمی ئەورووپی یەکیەتیی بابەت مەرجێک بوو لە ئەدەبیاتەکەیدا، بەڵام لای کورد بەپێچەوانەوە.
- ئێمە بە سەرجەم ئەدەبیاتی کوردیی سەدەکانی ١١م تا ١٩م دەڵێین «کلاسیک»، بەڵام دەشزانین کە فلان شاعیری سەدەی هەژدەم (بۆ نموونە مەولەوی) لەچاو فیسار شاعیری سەدەی سێزدەم نوێگەر و کەمێک جیاواز بووە. ئەم تێک نەهاتنەوەیە با قیامەتی لەسەر هەڵنەستێ و قبووڵی بکەین، چ قەیدییە، بەتایبەتیش چونکە هەردووکیان (ئەوەی سەدەی هەژدەم و ئەوەی سەدەی سێزدەمیش) لەناو یەک جۆر سیستەمی بیر و ڕێسای نووسیندا کاریان کردووە.
- هەر یەکێک لە شاعیر و نووسەرەکانی سەدەکانی ڕابردوومان خاوەن نوێگەری و تایبەتمەندیی خۆیان بوونە. ئەمەش چونکە، هەمووومان ئەوە دەزانین کە تایبەتمەندی و تازەگەرییەکانی بۆ نموونە ئەحمەدی خانی (داستانەکانی، بیرە نەتەوەییەکەی، ڕەنگڕشتنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو شیعردا..) لەلای باباتاهیری هەمەدانیدا بە هیچ شێوەیەک نابینین. بەڵام وەکو گوتمان (لەپێناو ئاسانکردنی تێگەیاندن و دۆزینەوەی مێتۆدێکی لەبار بۆ توێژینەوە و لێکتر حاڵی بوون، هەروەها سەبارەت بەوەی هەردووکیان لەناو یەک جۆر سیستەمی بیر و ڕێسای نووسیندا کاریان کردووە) دێین هەموویان لەناو یەک چوارچێوەی گشتیی کلاسیزمدا دەخوێنینەوە.

کەواتە، بە هەمان شێوە، کاتێ باسی کۆنبوونی یان کلاسیک بوونی نالی-ش دەکەین، دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە - ئەگەرچی نالی وەک ئەحمەدی خانی خراوەتە ناو هەمان قۆناغی کۆنەوە - بەڵام نالی لەچاو ئەحمەدی خانی خاوەن تایبەتمەندی و نوێگەرایی خۆیەتی و پێویستە لەو تایبەتمەندی و نوێگەراییەی ئەو بەوردی بکۆڵدرێتەوە. بە هەمان شێوە بەگوێرەی مەولەوی و حاجی قادری کۆییشەوە.

**سەرچاوە:**


R. BRAY: La formation de la doctrine classique en France, Paris: 1951

Fidao- Justiniani: Qu est-ce qu un classique? Paris: 1930

Dictionnaire Encyclopedique Larousse, Paris: 1979.

Henri Lemaitre: La poesie depuis Baudlaire, Ed. Armand Colin Coll., Paris: 1965. P. 85-101

Ch. M. Des Granges: Histoire de la litterature Francaise, Ed. Hatier, Paris: 1962. P. 850-902.

George Emmanuel CLANCIER: Panorama de la poesie francaise, Ed. Seghers, Paris: 1970

Claude BONNEFOY: La poesie des origines a nos jours, Ed. Seuil, Paris: 1975.

Taine HYPROLYTE: Histoire de la Litterature Anglaise, Paris: 1865.

Cornell Kenneth: The Symbolist movement, New Haven, Conn: 1958.

رضا سید حسینی: مکتبهای ادبی، تهران؛١٩٥٧.

د. حسن هنرمندی: بنیاد شعر نو در فرانسه، طهران: ١٣٥٠.

دومینیک سکرتان: کلاسیسیزم، ت: حسن افشار، نشر مرکز، تهران: ١٣٧٥.

عبدالحسین سعیدیان: دایره المعارف ادبی، تهران،١٣٦٣ی هەتاوی، ل٤٧٧.

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: ڕێنسانس، فوئاد میسری کردوویە بە کوردی، بەغدا: ١٩٨٤.

هۆراس: هونەری شیعر، حەمید عەزیز کردوویە بە کوردی.

د. عەلی لیلە: سەردەمی ڕۆشنگەری و هاتنەئارای کۆمەڵگەی مەدەنی، گ. ڕامان، ژ ١٤ - ١٥. هەولێر: ١٩٩٧

د. محمد مندور: الكلاسيكية في الاداب و الفنون العربية و الفرنسية.

د. ماهر حسن فهمي و د. كمال فريد: الكلاسيكية في الاداب و الفنون العربية و المسرحية، قاهرة.

د. محمد محمد صالح: تاريخ اوروپا من عصر النهضة و حتى الثورة الفرنسية، بغداد: ١٩٨٢.

# وشەی رۆمانسیزم

رۆمانسیزم Romantisme یان رۆمانتیزم بەو بزووتنەوە رۆشنبیری و ئەدەبی و هونەرییە دەگوترێ کە لە ئەورووپا لە کۆتایی سەدەی ١٨م بەملاوە بنەماکانی ئازادی و زاتییەتیان Subjectivite بلاوکردەوە دژی بنەماکانی کلاسیزم و عەقڵخوازیی فەیلەسووفانەی کلاسیکەکان.

رۆمانسیزم Romantisme بە رێبازەکە دەگوترێ، بەڵام رۆمانتیک Romantique ئاوەڵناوە، هەروەها بە داهێنی سەر بە رێبازەکە دەگوترێ. وشەی رۆمانسییەت هەمان واتای رۆمانسیزم دەگەیەنێ. وشەی رۆمانسی واتای رۆمانتیک (نووسەر و هونەرمەندی رۆمانتیک) دەگەیەنێ.. عەرەب و کورد دایانهێناون.

وشەی رۆمان Roman لە زمانی لاتینی و لە زمانە سەرەکییە ئەورووپییەکاندا گەلێک واتای جۆراوجۆر دەگەیەنێ، لەوانە:

- ئەو زمانانەی کە لە لاتینییەوە هاتوون وەکو ئیتالی، فەرەنسی، پورتوگالی، ئیسپانی، رۆمانی.
- ئەو هونەر و شێوازە هونەرییەی کە لە ئەورووپادا لە ماوەی سەدەکانی ١١و ١٢دا سەری هەڵدا و بلاوبووەوە.
- ئەو چیرۆکانەی بە شیعر یا بە پەخشان بە زمانی رۆمانی لە سەدە کۆنەکاندا نووسراون، وەکو Roman de la Rose و Roman d Renart
- چیرۆکێک بە پەخشان لەسەر بنچینەی خەیاڵ ژیانێکی پڕ لە جەربەزەیی و هەستخرۆشێن بگێڕێتەوە.
- لێکۆڵینەوەی شەخسیەت و حەز و خولیا و هەست و سۆزی مرۆڤ.

هەروەها Romance بەم واتایانە دێ:

- کورتەشیعرێک
- گۆرانییەکی هەستخرۆشێن و ناسک
- شیعرێکی میللیی سۆزاوی کە قافیەی هەشت بڕگەیی هەبێت.

وشەکانی Romancer و Romanticsme و Romanesque و Romantique هەر لەمانەوە دروست کراون. رۆمانسیزم لە سەرەتادا لە ئەڵمانیا لە ١٧٩٧ (لەسەر دەستی گۆتێ Goethe و شیلەر Schiller و هۆلدێرن Holderin و هۆفمان)، لە ئینگلستاندا لە ١٧٩٨ (لەسەر دەستی ۆردزۆرث Wordsworth، بلاک Blak، کۆلێریدج Coleridge)، ئنجا لە فەرەنسا لە ١٨٢٠ (لەسەر دەستی لامارتین و هووگۆ)، پاشان لە ئیتاڵیا (لەسەر دەستی مانزۆنی Manzoni و لێۆپاردی Leopadrdi )، ئینجا لە دواییدا لە ئیسپانیا و وڵاتانی ئەسکەندەناڤیدا سەری هەڵدا.

## ئەو دۆخە شارستانی و فیکرییەی رۆمانسیزم تێیدا سەری هەڵدا

شۆڕشی فەرەنسا (١٧٨٩) و دامەزراندنی سیستەمی پەرلەمانتاری، لە ئاکامی ئەمەشدا بڵاوبوونەوەی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ (کە زەمینەیان خۆش کرد بۆ وەدیهێنانی ئازادییەکانی تاکە کەس)، هاوزەمانی ئەمانەش شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشەکانی ئینگلستان (١٨٢٦-١٨٥٦)، پێش ئەمانەش ئەو بزاڤە فیکرییەی کە بە «سەردەمی رۆشنگەری» ناسراوە لە ئەورووپای سەدەی هەژدەمدا (لە ئەڵمانیا بە رێبەرایەتیی هیگڵ ١٧٧٠ - ١٨٣١ و کانت ١٧٢٤ - ١٨٠٤، لە فەرەنساش بە رێبەرایەتیی ژان ژاک رووسۆ ١٧١٢- ١٧٧٨ و ڤۆڵتێر ١٦٩٤ - ١٧٧٨ و دیدرۆ و مۆنتسکیۆ، لە ئینگلستانیش بە رێبەرایەتیی جۆن لۆک (١٦٣٢- ١٧٠٤) کاریگەرێتییەکی زۆریان هەبوو بەسەر گۆڕانی ژیانی ئەورووپا و سەرهەڵدانی بیرکردنەوەی رۆمانسیانە و لە کۆتاییدا دامەزرانی رێبازی رۆمانتیسم.

جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ، کە لە دەسکەوتەکانی شۆڕشی فەرەنسا و دامەزرانی سیستەمی پەرلەمان بوو، لە ٢٦ی ئاوگوستی ١٧٨٩ داڕێژرا، چەند پرەنسیپێکی گرنگی کردە دەستوور لەپێناو بەرگریکردن لە مافی تاکەکەس و ئازادییەکانی - کە پێشتر، لە سەردەمی کلاسیزمدا تەنانەت بیرلێکردنەوەشیان بڤە بوو، بۆ نموونە:

**بەندی** ١: مرۆڤ، هەموویان بە ئازادی لە دایک دەبن، یەکسانیشن لە نرخ و پایە و مافدا. عەقڵ و ویژدانیان پێ بەخشراوە و دەبێ بە رۆحێکی برایانە رەفتار لەگەڵ یەکتر بکەن.

**بەندی** ٢: هەموو مرۆڤێک بەبێ هیچ جیاوازییەک (رەگەز، رەنگ، جنس، زمان، ئاین، بیروڕای سیاسی..) شیاوی سوودوەرگرتنن لە تەواوی ئەو ماف و ئازادییانەی کە لەم بانگەوازەدا هاتوون.

**بەندی** ٣: هەموو کەسێک مافی ژیان و ئازادی و ئاسایشی خۆی هەیە.

**بەندی** ٤: نابێت هیچ کەسێک بکرێت بە کۆیلە و بە نۆکەر بگیرێت. هەموو چەشنە کۆیلەتی و بازرگانیی کۆیلەیەک قەدەغەیە.

**بەندی** ٥: هیچ مرۆڤێک ئەشکەنجە و سزا نادرێت، رەفتاری توندوتیژ و دڕندانە و ئابڕووبەری لە گەڵدا ناکرێت.

**بەندی** ٧: مرۆڤ، هەموویان لە بەردەم قانووندا یەکسانن، مافی ئەوەشیان هەیە کە بێ جیاوازی لەلایەن قانوونەوە بپارێزرێن.

**بەندی** ٨: هەموو کەسێک بۆ داوەری کردن و پاراستنی مافە بنەڕەتییەکانی کە قانوون پێی داوە، لە کاتی دەستدرێژی کردنە سەریدا، مافی پەنابردنەبەر دادگە نیشتمانییەکانی هەیە.

**بەندی** ٩: هیچ مرۆڤێک نابێت بەشێوەیەکی رەمەکی بگیرێت، دەسبەسەر بکرێت یان دوور بخرێتەوە.

**بەندی** ١٨: هەموو کەسێک مافی ئازادیی بیرکردنەوە و ویژدان و ئایینی هەیە. ئەم مافە ئازادیی گۆڕینی ئایین و بڕوا دەگرێتەوە و مرۆڤ لە دەربڕینی ئەو ئازادییەشدا، بە فێربوون و خەریکبوون و ئەنجامدان و پەیڕەوکردنی داب و دەستووری ئەو ئایین و بڕوایە بەپەنهانی یا بەئاشکرا، بە تەنێ یا بە کۆمەڵ، ئازادە.

**بەندی ١٩**: هەمــوو کــەســێک مــافی ئازادیی بیــروڕا و ڕادەربڕینی هەیە، ئەم مــافــەش هەڵگرتنی بیــروڕا بەبێ خۆتێکەڵکردنی کەسێکی دیکە و وەرگرتنی هەواڵ و باوەڕ و بڵاوکردنەوەیان بە هەر شێوەیەک و بێ خۆبەستنەوە بە سنووری جوگرافی دەگرێتەوە.

**بەندی ٢٠**:

١. هەموو کەسێک مافی ئازادی و بەشداربوونی کۆمەڵە و تاقمە ئاشتیخوازەکانی هەیە.

٢. نابێت هیچ کەسێک بۆ چوونە ڕیزی هیچ کۆمەڵەیەک ناچار بکرێت.

**بەندی ٢٣**:

١. هەموو کەسێک مافی کارکردن و ئازادیی هەڵبژاردنی کاری هەیە لە سایەی چەند مەرجێکی ڕەوا و ماقوولدا، هەروەها مافی پاراستنی لە بێکاری هەیە.

٣. هەموو کەسێک کە کاردەکات مافی مووچەیەکی ڕەوا و قایلکەری هەیە، مووچەیەک کە ژیانێکی لەبار و وەک مرۆڤێکی سەربەرز بۆ خۆی و خێزانی دابین بکات؛ لە کاتی پێویستیشدا ئامرازی دیکەی بخرێتە سەر بۆ بیمی کۆمەڵایەتی.

٤. هەموو کەسێک بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، مافی دامەزراندن و بوون بە ئەندامی سەندیکای هەیە.

**بەندی ٢٤**: هەموو کەسێک مافی پشوودان و کاتی ڤاڵا و بەتایبەت مافی دیاریکردنێکی لەباری سەعاتەکانی کار و مافی پشوودانی دەوریی بە مزی هەیە.

**بەندی ٢٥**:

١. هەموو کەسێک مافی ژیانێکی تێرای هەیە کە بەشی پاراستنی لەشساغی و خۆشگوزەرانیی خۆی و خێزانی بکات، ئەوەش خۆراک و پۆشاک و خانوو و چاودێری پزیشکی و خزمەتە کۆمەڵایەتییە پێویستەکان دەگرێتەوە. هەروەها مافی بیمەکردنی ژیانی لە کاتی بێکاری و نەخۆشی و پەککەوتەیی و بێوەژنی و بێوەپیاوی و پیری و لەدەستدانی ئامرازی ژیان بەهۆی هەلومەرجی دەرەکییەوە کە لە دەسەڵاتی مرۆڤ بەدەرە.

٢. دایک و منداڵ مافی یارمەتی و چاودێرییەکی تایبەتییان هەیە، هەموو منداڵانیش ئەگەر بەڕێگەی شەرعی یان نا شەرعی لەدایک بووبن دەبێ هەمان پارێزگاریی کۆمەڵاتییان هەبێت.

تا دەگاتە: **بەندی ٢٦**:

١. هەموو کەس مافی فێربوونی هەیە و دەبێ بە لای کەمەوە پلە سەرەتایی و بنەڕەتییەکانی خوێندن بەخۆڕایی بن. دەبێ خـوێندنی سـەرەتایی بەزۆر بێت، خـوێندنی هونەری و پیـشـەییش بڵاوبکرێتـەوە. وەرگـرتن لـە خـوێندنی بەرزیش، بەیەکسانیی تەواو، بۆ هەمووان و بەپێی توانا، هاسان بکرێت.

فەیلەسووفی ئەڵمانی، ئێمانوئێل کانت (١٧٢٤ - ١٨٤٠) لە کتێبی (ڕەخنە لە عەقڵی بێ خەوش)دا چێژی جوانی بەستایەوە بە سەرنجدەرەوە نەک بە بابەتەکەوە. هەروەها، بە بۆچوونی کانت، ئامانجی جوانیی بابەتەکەش و هەستی خۆشییەکەش هەر لە خودی سەرنجدەرەوە پەیدا دەبێ نەک لە بابەتەکەوە.

ئەمەش سیفەتێکی ڕێژەییانەی بەخشییە «جوانی» چونکە لەم کاتەدا هەر کەسێک بۆ خۆی خاوەن بینینێکی تایبـەتی و جـیـاواز لە یەکـێکی دیکەی، لە بارەی حـوکـمـدانی بۆ جـوانی، دەبێت. ئەمـەش بووە بنەمـایەک بۆ

ڕۆمانسییەکان.

جگە لەمەش، کانت پێی وابوو جوانی لەناو خودی شتەکەدا نییە، بەڵکو لەو تێگەیشتنەدایە کە لای بینەر هەیە بۆ جوانی. ئەمەشیان هەر دیسانەوە، کاری کردە سەر ئەوەی تاکەکەس لەمەودوا زۆرتر متمانە بە تێگەیشتن و چێژی جوانیناسیی خۆی بکات و چیتر گوێڕایەڵی چێژی باوی گەلەکۆیی نەمێنێتەوە.

بەم شێوەیە، لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی بیری کانتەوە، جوانی، چیتر وەک باوەڕێکی باوی کلاسیک نەمایەوە: لە بابەتییەوە گۆڕا بۆ ڕێژەیی و خۆیی. ڕۆمانسییەکان سوودیان لێ وەرگرت.

کانت دەڵێ: «پێوەری چێژ پەیوەندیی بە لۆژیکەوە نییە، شتێکی جوانیناسییە. واتە بنچینەی چێژوەرگرتن هەمیشە شتێکی زاتییە. هەموو کەس، هەر کەسە و بە بینینی تایبەتی خۆی، عەوداڵی یەک ئامانجە کە ئەویش دڵخۆشبوونە، چێژوەرگرتنە».

کانت، بەپێچەوانەی کلاسیکەکانەوە دەڵێ: «جوانی ئەو شتەیە کە بەبێ تێگەیشتنی عەقڵی پێمان خۆش بێت. بۆ سەلماندنی جوان، پێویست ناکات پەنا ببەینە بەر بەڵگەی عەقڵی. چونکە حوکمی چەشە پەیوەندیی بە دەستوور و یاسای عەقڵییەوە نییە».

جەوهەر، بە تێگەیشتنی کانت: «شێوەیە نەک واتا. لە تابلۆیەکدا، یان لە پەیکەرێکدا تەنانەت لە هەموو هونەری پلاستیکی و ئارشیتێکتووریدا، جەوهەر تەنیا نیگارەکانە. ئەوەی سەرنجڕاکێشە واتا نییە بەڵکو شێوەکەیەتی، کە حاڵەتە بنچینەییەکە بۆ چێژوەرگرتن خۆش دەکات. ئەو ڕەنگانەی وێنەکانیان پێ کێشراوە هێند سیحراوین کە دەتوانن هەر بابەتێک بۆ واتا دروستکردنی خۆیان بدۆزنەوە».

کانت دەڵێ: بەتەنێ بڕۆ و هۆشی خۆت بەکاربێنە!

دروشمی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەمە بوو: ئازایی ئەوەت هەبێ کە خۆت هۆشی خۆت بەکار بێنیت! لەم بارەیەوە، کانت دەڵێ: «جگە لە دەبەنگی، ئەمە هیچ هۆیەکی دیکەی نییە کە سروشت هەر لە مێژەوە پلەی باڵغبوونی بە زۆربەی مرۆڤەکان گەیاندبێت و کەچی هەمان ئەم مرۆڤانە، بە خواستی خۆیان، تا دوا هەناسەی ژیان هەر لەنێو هەرزەکاریدا بچەقن و ڕێگا بە خەڵکی دیکەی غەیری خۆیان بدەن کە بەئاسانی ببنە سەرپەرشت و دەمڕاستییان». ئەم ڕابەر و سەرپەرشتارانە، پێش هەموو شتێک دێن هۆشی «مێگەلە دەستەمۆکەی خۆیان» بەتاڵ دەکەن بۆئەوەی خۆیان دڵنیا بکەن کە ئیدی «ئەم بوونەوەرە بێ وەی و بەستەزمانانە» جەسارەتی ئەوەیان نییە تەنانەت هەنگاوێکیش لەو کاوێژگەیە دووربکەونەوە کە تێیدا زیندان کراون.. ئنجا پاشان ئامۆژگارییان دەکەن و پێیان دەڵێن: «گەلۆ، بەتەنێ ڕۆیشتن کارێکی گەلەک مەترسیدارە».

ئەم پرەنسیپە فەلسەفییەی کانت هێزی یاخیبوونی بەخشییە ڕۆمانسییەکان.

ناوبراو، لە کتێبی (ڕەخنە لە بەهرەی داوەریکردن)دا، پێی وایە کە «جوانی سوودی نییە»، یان ڕاستتر: نابێ جوانی لە پێناو سوود بەکاربهێنرێت. بە ڕای ئەو: جوانی، پێویستە ئازاد و سەربەخۆ بێت. لەم بارەوە دەڵێ: «کاتێ قسە لەسەر ئەوە دەکرێ کە فلان شت جوانە، کەس باسی ئەوە ناکا ئایا ناوەڕۆکی ئەو شتە هیچ سوودێکی بۆمان هەیە یان نا. بەم شێوەیە، جوانی ئەو شتەیە کە هەموو کەس لە فۆرمە دیاریکراوەکەیدا پێی خۆش بێت، بێ ئەوەی کەس بەرژەوەندیی لەمەدا هەبێ».

کانت پێی وایە: کۆمەڵ خۆی ئەو کەڵکە بە هونەر دەبەخشێت و سوودێکی بۆ دەدۆزێتەوە. چونکە، بە بۆچوونی

کـانت، ئەگـەر مـرۆڤ لەناو کـۆمـەڵدا نەبووایە ئەوا بیـری جـوانکردن و خـۆجـوانکردن و ڕازاندنەوەی لەلا دروست نەدەبوو. کـەواتە مـەیلی کـۆمـەڵایەتیـیـە وامـان لێ دەکـات کـە بایەخـێکی پراتیکی یان سـوود یان خـاسـیـەتێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی بدەینە جوانی.

بەم شێوەیە، کانت دژی ژێردەستەکردنی هونەر بۆ قازانجی سیاسەت و ڕەوشتی بۆرژوازی وەستا.

بە تێگەیشتنی کانت: شۆڕش ناتوانێ بیرکردنەوەی خەڵک بگۆڕێ. شۆڕش لەوانەیە بتوانێ کۆتایی بە ملهوڕێتیی تاکـەکـەسانە و سـەرکـوتکردنی سـوودپەرسـتـانە بهـێنێت، بەڵام هەرگـیـز لە توانایدا نیـیـە، وەک ئەوەی پێـویـسـتـە، بیرکردنەوە و ڕەوتی بیرکردنەوەی خەڵک بگۆڕێت. بەپێچەوانەوە، لە جیـاتی پێشداوەرییە کۆنەکـان، کۆمەڵێک پێشداوەریی تازە دەخاتە ئارا کە دەبنە نێڵی گەردەنی خەڵک. کەواتە لێرەدا هیچ شتێک هێندەی ئازادی پێویست نیـیـە، ئازادیی ئاشکرا لە بەکـارهێنانی عـەقڵدا لە هەمـوو بوارەکان. کـەواتە، نەک شـۆڕش، بەڵکو تەنیـا ئازادی و ئازادیی بیـرکردنەوەیە کە دەتوانێ بیرکردنەوەی خـەڵک بگۆڕێ. ئەم پرەنسـیـپـەش، درەنگتـر بووە یەکێک لە بنەما گرنگەکانی ڕۆمانسیزم.

بەم جۆرە، کانت کاری زۆری کردە سەر ڕۆمانسییەکان، بەتایبەتی گۆتە و شیلەر و کۆلرێدج. لەمەش زیاتر، چەند بنچینەیەکی سەرەتایی دامەزراند تەنانەت بۆ پەرناس و فۆرمالیست و ئەبستراکتەکانیش.

فـەیلەسووفی ڕۆشنگەری ئەڵمانـی، هیگڵ ١٧٧٠-١٨٣١ کە هاوسـەردەمی ڕۆمانسیـیـەکان بوو، کـاریگەرییـەکی ئەوتۆی نەبوو بـەسـەر ڕۆمـانسـیـیـەکـانەوە، بەڵکـو بەپێچەوانەوە دەیویست بناغـەیەکی عـەقڵانی و فـەلسـەفی بۆ ئەو هەست و سـۆزە ڕۆمـانسـیـیـانەی ئەوان دابڕێژێت. بەڵام لە هەمـان کـاتدا، هیگڵ هەر لەو سـەردەمەوە کە گـەنج بوو، دەیویست یـانەیەک دروست بـکات لەپێناو بڵاوکـردنەوەی باوەڕە ڕۆشنگەرییــەکــانی شــۆڕشی فــەرەنســا بەناو قوتابییاندا. هەر بۆیەش لە ساڵی ١٨٠١دا چووە شاری ئیـەنا کە مـەڵبەندی کۆبوونەوەی ڕۆمانسـیـیـەکانی ئەڵمـانیا بوو، لەوێ پەیوەندییەکی کاریگەر و توندی لەگەڵ نەوەی یەکەمی ڕۆمانسییە ئەڵمانییەکاندا پەیدا کرد.

ژان ژاک ڕووسـۆ ١٧١٢- ١٧٧٨، فـەیلەسووفی ڕۆشنگەری فـەرەنسی، لەوانەیە لە هەمـوو فـەیلەسـووفێک زیاتر ناوی بێت لە ڕووی کاریگەریی بەسەر بڵاوکردنەی بیری ڕۆمـانسیـیانە و دامـەزراندنی ڕۆمانسیزم. ئەمـەش سەبارەت بەوەی کە ئەو زۆر بەفراوانییەوە جەختی کردە سەر پێویستبوونی خۆئازادکردن لە دەست نێڵی دابونەریتەکانی کۆمەڵ و ڕەفزکردنەوەی دەستوور و یاساکانی کۆمەڵگەی کلاسیزم.

ئەو، لە کتێبە ناودارەکەیدا «پەیمانی کۆمەڵایەتی» زۆر باریکبینانە ئەو سیـستەمە هەڕەمییەی کۆمەڵگە کلاسیکی هەڵوەشـاندەوە کە وەک مـۆتەکـە سـواری سنگی تاکـەکـەس ببـوو و ئازادییـەکـانی تاکـە کـەسی دەپلیـشـاندەوە. ئەوەی دەسـتـنیـشـان کـرد کـە «پەیوەندییـەکی مـیـکرۆفـیـزیـایی چەوسـاندنەوە» لە لـوتکەی دەسـەڵاتەوە تا بچـووکـتـرین ئەندامەکانی کۆمەڵ، لەسەر حسێبی زەوتکردنی ماف و ئازادییەکانی تاکەکەس هەڵچنراوە.

سـەربەسـتـیی تاکـەکـەس، بە بۆچوونی ڕووسـۆ، نـابێـتـە هۆی نائـارامـیی دەوڵەت.. بەڵکو ئەو ئازادییـە تەنیـا چەوساندنەوە و کۆیلایەتییەکەی تاکەکەس ڕادەماڵێ: ئەمەش چونکە لای ڕووسۆ مرۆڤ خۆی خێرخوازە.

ڕووسـۆ سـۆز و خـۆشـەویسـتی و غـەریزە لە جیـاتی زانست و تەکنەلۆژیا دادەنێ. ئەمـەش چونکە، مـرۆڤ لەناو کۆمەڵی تەکنەلۆژیدا دەبێتە ملکەچی دابونەریت و ڕێساکان، وای لێ هاتووە کە خەسڵەتە سروشتییەکانی خۆی لە دەست بدات و دەمـامکەکان ببەستێت. بۆیە لای ڕووسۆ «مرۆڤی هوشیـار و بەئاگا» واتە ئەو مرۆڤەی کە کوێرانە

پیادەی دەستوورەکانی کۆمەڵ دەکات، «لە ئاژەڵێکی گەندەڵ زیاتر هیچی دیکە نییە».

بەم شێوەیە، رووسۆ باوەڕی وابوو کە مرۆڤ پێویستە بگەڕێتەوە بۆ غەریزە سروشتییەکانی خۆی (سۆز، دڵ و دەروون، خەیاڵ، ژیانی سروشتی)، پێویستە واز لەو ژیانە ساختەیەی ژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵگەی نوێی تەکنەلۆژیی بهێنێت و ئاوها بژیت کە سروشتی خۆی دەیخوازێ: بە هەموو خەون و خولیا و غەریزە و سۆز و هەستێکی کە لە دەروونی خۆیدا هەیە.

رووسۆ بەپێچەوانەی هۆبز، پێی وا نییە کە سروشتی خۆرسکییانەی مرۆڤ (کە هۆبز پێی وایە شەڕەنگێزانەن) بەرەو جەنگ و هەرا و تالان و برۆ و خراپەکاری رامانپێچی، بەڵکو هەموو ئەمانە خۆیان بەرەنجامی دۆخی کۆمەڵایەتی و هاتنە ئارای شارستانییەتن.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨م بەملاوە، واتە لە سەردەمی رۆشنگەریدا، چینی ئەشراف و دەرەبەگ وردە وردە دەسەڵات و ئیعتیباری خۆیان لەدەست دەدا. بەتایبەت لە رووی ئەخلاقییەوە، فەساد، تێکشکانی پەیوەندییەکانی خێزان، شیرازە تێکچوونی کۆمەڵایەتی زۆرتر دەبوون، باری ئابووریش روو لە خراپتر بوو. وۆردزۆرث ١٧٧٠-١٨٥٠، لە ١٨١٧دا نووسی: پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانی نێوان ئەندامانی چینەکانی کۆمەڵ، لە ماوەی ئەم سی ساڵەی دواییدا یان هەر بەتەواوەتی سەرەونگوون کران یانیش بەشی زۆریان لای زۆربەی خەڵک شیرازەیان تێکچوو..».

شار قەرەباڵغتر، ئاژاوە زیاتر؛ ئیدی چوونەژێر باری قانوون و دەسەڵات و دەوڵەت شتێکی زەحمەت بوو. ئنجا دوایەش ئەورووپا شۆڕشەکانی ئینگلستان و شۆڕشی فەرەنسای ١٧٨٩ی بەسەردا هات و دنیا بەتەواوەتی گۆڕا.

بەم شێوەیە شێوازی بیرکردنەوەی خەڵک و نەوەی تازە لە شێوازی بیرکردنەوەی کلاسیکەکان جودا بووەوە. نووسەرانی نەوەی تازە ئامادە نەبوون چیتر بچنە ژێر رکێفی قەبوولکردنی بیرکردنەوەی کۆنی کلاسیکەکان. نووسەرانی نەوەی تازە دەیانویست گفتوگۆ لەسەر مەسەلە جۆراوجۆرەکانی ژیانی خۆیان بکەن و ژیانی خۆیان باشتر و خۆشتر بکەن و بەرەو پێشەوەی ببەن؛ بە شێوەیەک کە لە شارەکانی فەرەنسا، لە ٢٥ ساڵی دوایی سەدەی ١٧مدا پێنج فەرهەنگستان و لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨ مدا بیست فەرهەنگستان دامەزران. ژمارەی رۆژنامە روویان لە زیادبوون کرد. مرۆڤ زیاتر کەوتە ناسینی دەوروبەری خۆی و وڵاتانی تر.

سەدەی ١٧م تەنیا سروشتێکی جاویدان و عەقڵێکی نەگۆڕی هەبوو و بەس! دەستوورێکی گشتی سەقامی گرتبوو و نەدەبووایە لێی لابدەی. بەڵام لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨م بەملاوە ئەورووپاییەکان درکیان بەوە کرد کە ژیان و جیهان زۆر لەوە گەورەتر و فراوانترە کە کلاسیکەکان تێی گەیشتبوون. نووسەران ئیدی چیتر پێویستی و مننەتیان بەوە نەما کە بە گوێی ئامۆژگارییەکانی کلاسیکەکان بکەن لەبارەی ئەوەی کە داهێنانی ئەدەبی ببەسترێتەوە بە چەند یاسا و دەستوور و بنەمایەکی ئێستاتیکیی وشک و نەگۆڕ و لە قاڵب دراو. لە باری کۆمەڵایەتیشەوە کەوتنە یاخی بوون دژ بە سیستەمی بیرکردنەوە و ژیانە کۆمەڵایەتییە کلاسیکییەکە.

وەک لە باسی کلاسیکەکاندا بینیمان، رێنسانس لەژێر کاریگەرێتیی چینی دەرەبەگدا سەری هەڵدا و سەدەکانی کلاسیک سەدەکانی حکوومەت و دەسەڵاتی ناوەندیی زنجیرە یەک لە دوای یەکەکانی پاشاکان بوو. ئەم قۆناغە تازەیەی رۆمانتیکەکانیش قۆناغی بۆرژوازییەت بوو. چونکە چینی ئەشراف و دەرەبەگ وردە وردە دەسەڵات و ئیعتیباری خۆیان لەدەست دابوو.

ئەدەبیات و کولتووری سەردەمی ڕێنسانس ڕێگەخۆشکەرێک بوو بۆ ئەوەی درەنگتر- لە ناوجەرگەی سەردەمی ڕۆشنگەریدا - ڕۆمانسیزم سەرهەڵبدات: مرۆڤ لە دەست لێکدانەوە ئایدیالیستەکان و لە دەست هێزە غەیبییەکان ئازاد بکات و بیکات بە مرۆڤێکی دنیایی.

لە سەدەی حەڤدەوە دەبینین سۆز زیاتر بەناو مرۆڤ و کۆمەڵگەی ئەورووپیدا بڵاودەبێتەوە، تەنانەت لە بواری فەلسەفەشدا دەبینین ژان ژاک رووسۆ وا باس دەکات کە مرۆڤ خۆشەویستییەکی غەریزیی بۆ خێر و خۆشەویستی هەیە، ئەمەشی لە بلیمەتایەتیی سروشتەوە وەرگرتووە.

ئەدەبیات و فەلسەفەی سەردەمی ڕۆشنگەری، لە سەدەی ١٨دا، مرۆڤی وەک ناوەندێکی واقیع و وەک نموونەیەکی کۆمەڵگە پیشانی خەڵک دا. جۆن لۆک ١٦٣٢- ١٧٠٤ دامەزرێنی ڕۆشنگەری لە بەریتانیا، ئەوەی ڕوونکردەوە کە مرۆڤ هەر بە غەریزە بیروبۆچوون و شەڕ یان خێری لەگەڵ خۆی هەڵنەگرتووە - ئەوەی کە فەلسەفە ئایدیالییەکەی دیکارت باوەڕی پێ بوو. جۆن لوک هەموو شتێکی گەڕاندەوە بۆ ژینگە و ئەزموونەکان: «مرۆڤ خۆی بەرپرسی یەکەمە لە ئاسوودەبوون یان بەدبەختبوونی مرۆڤ». ئەم بۆچوونەی لۆک نەک تەنیا بۆ ڕۆمانسییەکان شتێکی تازە بوو، تەنانەت دواتر ڕیالیستەکانیش سوودیان لێی وەرگرت.

هەروەها هەر لە سەدەی ١٨مدا، لای لیسنک و دیدرۆ، کێشەی هونەر، دیسان دەبێتەوە جیهانبینیی تاکەکەس. دنیا لەپێش چاوی تاکەکەس وردە وردە دەدۆزرێتەوە، دەبێتە ناوەندێکی دنیا.

لە سەدەی ١٨مدا خەڵک دەمێک بوو دەستیان کردبووە خۆفێرکردنی زمانە ناوچەییەکان، ئەمەش لە قوتابخانە عەلمانییەکانی دەرەوەی کەنیسەی قەشەکاندا. کەواتە، فێربوون و بەکارهێنانی زمانە ناوچەییەکانی غەیری لاتینی، وردە وردە، ببووە هۆی ئەوەی کە خوێندەواری وەک ئیمتیازێکی کەنیسە و پیاوانی دینی نەمێنێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە وای لێهات کە خوێندەواری مۆرکێکی عەلمانی بەخۆوە بگرێت و ڕۆشنبیرییەکی فراوانتر بگرێتەوە.

دەسکەوتێکی دیکەی سەردەمی ڕێنسانس دروستبوونی دەوڵەت - نەتەوە بوو، واتە دروستبوونی دەوڵەت لەسەر بنچینەی نەتەوە. ئەمە وای کرد زمانی لاتینی کە زمانی نووسینی زۆربەی نەتەوەکانی ئەورووپا بوو وردە وردە بداتە پاش و زمانی نەتەوەکان برەو بسێنێ و هەر نەتەوەیەک زمان و ڕۆشنبیریی نەتەوەیی خۆی ببووژێنێتەوە و ناسیونالیزم سەرهەڵبدات.

## سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم لە ئینگلستاندا

ڕۆمانسیزم، لە سەرەتادا، هاوکاتی ئەڵمانیا، لە ئینگلستاندا سەری هەڵدا.

شاعیرانی «دەریاچەخواز» یان لاکیستەکان Lakistes دەستەیەکی شاعیرانی ئینگلیز بوون، لە دەوری دەریاچەکانی باکووری ئینگلستان دەژیان. لە نێوان ساڵانی ١٧٩٨ و ١٨١٥دا یەکەمین کۆمەڵە شیعری ڕۆمانتیکانەی خۆیان بڵاوکردەوە.

لە هەموو ئەو شاعیرانە ناودارتر: ویلیام وۆردز وۆرث ١٧٧٠- ١٨٥٠ W. Wordsworth کە بە "شاعیری سروشت" ناودارە. وەسفی ژیانی گوند و غەزەلەکانی و هەستی پاک و سادەیی و ڕەوانیی شیعرەکانی ئەو نموونەیەکی دیاری ڕۆمانسیزمی ئینگلیزین. وۆردزۆرث یەکەمین شاعیری ڕۆمانسییە کە بۆ یەکەمین جار ڕۆمانسیانە کەوتبێتە بیرکردنەوە لە چینی هەژار و جوتیار و چەوساوەکان و ژیانی کولەمەرگی و نالەباری ئەوانی دەربڕیبێ.

وردزۆرث لە پێشەکیی ئەو دیوانە شیعرە هاوبەشەدا کە لەگەڵ کۆلریدج پێکەوە لە ١٧٩٨دا بڵاویان کردەوە، نووسیی: «ئامانجی سەرەکیمان لەم هەڵبەستانە ئەوەیە کە رووداو و هەڵوێستەکان لە ژیانی عادییەوە هەڵبژێرین و چەندی پێمان بکرێ بە زمانێک وەسفیان بکەین کە زمانی خەڵک بێت..»

شاعیرێکی دیکەی ئینگلیز: کۆلێریج S. T. Coleridge کە ژیانێکی بێ سەر و سامانی هەبوو، زۆربەی ژیانی بە حەشیشەکێشان بەهەدەرچوو. شیعرەکانی پڕن لە خۆشەویستی و غەم و پەژارە و نهێنی. کاریگەریی فەیلەسووفی ئەڵمانی، ئیمانوێل کانتی بەسەرەوە بوو.

ناودارترین شیعری کۆلێریج بریتییە لە «دەریاوانە پیرەکە» کە لەناو دیوانی «لیریکاڵ بالاد»دایە کە پێکەوە لەگەڵ وردزۆرث لە ١٧٩٨ بڵاوکرایەوە. حوسێن عەلی وەلی تەرجەمەی کردووە و لە گۆڤاری ڕامان، ژ ٣٧، ل ١٤٣-١٥٣ بڵاوکراوەتەوە.

لۆرد بایرۆن ١٧٨٨ - ١٨٢٤ L. Byron تەئسیرێکی یەکجار گەورەی هەبوو بەسەر پەرەسەندنی ڕۆمانتیزم لە ئەورووپادا. لە ١٨١٥ تا ١٨٥٠ بایرۆن ببووە مۆدێلێک و هەموو گەنجە هەستناسکەکان لاسایی شیعرەکانی ئەویان دەکردەوە. هەر هەموو ئەم شاعیرانە خولیای سەفەر و جەربەزەیی و ئازادی و خۆشەویستی بوون.

جگە لەمانە شیللی ١٧٩٧- ١٨٥١ P. B. Shelley خاوەن ڕۆحییەتێکی شیعریی لێوانلێو لە ئەڤین و شت و جوانی و ئازادی بوو. لایەنگری شۆڕش و شۆڕشگێڕ و زەحمەتکێشان بوو لە بواری سیاسەت و ئەخلاق و دیندا، بەڵام ئەم بیرانەی بەشێوەیەکی سادە و خەیاڵیانە دەردەبڕی.

شایانی باسە، کۆلێریج و شیللی و بایرۆن، هەرسێکیان کاریگەریی بۆچوونەکانی شلێگڵی ئەڵمانییان بەسەرەوە هەبوو: ئەمەش لە ڕێگەی کتێبەکەی شلێگڵەوە کە لە ١٨١٥ تەرجەمەی ئینگلیزی کرابوو.

جگە لەم شاعیرانە کیتس بایەخێکی زۆری دەدایە جوانی و ئازادی لە شیعرەکانیدا. ولیەم بلیک (بلاک) و کراب و کلێر.. شاعیرانی دیکەی ڕۆمانسیزمی ئینگلیزن.

لەناو ڕۆماننووسە ڕۆمانسییە ئینگلیزەکانیشدا والتەر سکووت Walter Scott بە بڵاوکردنەوەی چەند بەرهەمێکی وەکو بۆب ڕۆی Bob Roy و ئیڤانهۆ Ivanhoe ڕۆمانی مێژوویی هێنایە ناو ئەدەبیاتی تازەوە و لەلایەن ڕۆماننووسانی ڕۆمانسیی وڵاتانی دیکە لاسایی کرایەوە: لە فەرەنسا ڤیکتۆر هووگۆ (نۆتردامی پاریس) و (مێریمی)ی نووسی، ئەلکزاندەر دووماس (سێ تفەنگدار) و (چیرۆکی مۆنت کریستۆ)ی نووسی؛ لە ڕووسیا گۆگۆل (تاراس بۆلبا)ی نووسی.

## ڕۆمانسیزم لە ئەڵمانیا

ڕۆمانسیزمی ئەڵمانی بە سەر دوو نەوەدا دابەش دەکرێ:

١- یەکەمین نەوەی ڕۆمانسییەکان گرووپی برایانی شلێگڵ Shelegel بوو (فردریک شلێگڵ و ویلیام شلێگڵ)، کە لە ساڵی ١٧٩٧ لە شارەکانی بەرلین و ئییێنا سەری هەڵدا و تا سەرەتای سەدەی ١٩م بەردەوام بوو.

ئەم دوو برایە دەستوور و بنەماکانی هونەر و درامای ڕۆمانسیزمیان لێک دایەوە و کورتەیەکی مێژوویییشیان لەبارەیەوە نووسی و پاشان لە سەرەتای سەدەی ١٩مدا تەرجەمەی ئینگلیزی و فەرەنسی کرا. نووسەرێکی ناوداری دیکەی سەر بەم گرووپە ئۆگەست ڤێلهێلم (١٧٦٧- ١٨٤٥) بوو.

ئەم یەکەمین گرووپەی رۆمانسییە ئەڵمانییەکان پێیان دەگوترا رۆمانسییەتی ئییێنا.

لەم قۆناغەدا گۆتە شیعر و رۆمان و شانۆنامەکانی خۆی یەک لەدوای یەکتر بڵاوکردەوە، تەئسیریان نەک تەنیا بەسەر ئەڵمانیا بەڵکو بەسەر هەموو ئەورووپادا هەبوو. هەروەها فرێدریک شیلەری ئەڵمانی ١٧٥٩- ١٨٠٩بە شیعر و شانۆنامەکانی. هۆلدێرن و نۆڤالیس١٧٧٢-١٨٠١ بە شیعر. ئەم چوار نووسەرە کۆڵەگەی بنەڕەتیی قۆناغی یەکەمی رۆمانتیسمی ئەڵمانین.

٢- نەوەی دووەمی رۆمانسیزمی ئەڵمانی لە ساڵانی ١٨١٠ و ١٨٢٠ بەملاوە دەست پێدەکات لە شاری هایدلبێرگ، بۆیەش پێی دەگوترێ رۆمانسییەتی هایدلبێرگی.

بەم شێوەیە، رۆمانتیسمی ئەڵمانی لە چارەگی یەکەمی سەدەی نۆزدەم بەملاوە هێزێکی زیاتری پەیداکرد. وردە وردە ئەم نووسەرانەش دەرکەوتن: هۆفمان ١٧٧٦- ١٨٢٢لە بواری چیرۆکی خەیاڵیدا، هنریش ڤۆن کلێیست Kleist لە بواری شانۆنامەدا، ئارنیم١٧٨١- ١٨٣١ لە بواری شیعر و چیرۆکدا.

ئەم نەوە تازەیە، لە چاو نەوەی پێشوو، زیاتر بایەخیان بە تاکڕەوی و دەربڕینی مرۆڤ وەک تاکەکەس دەدا.

رۆمانتیسمی ئەڵمانی دوای جەنگی سەربەخۆیی ئەڵمانیا، لە کۆتایی سەدەی ١٩دا، گۆڕانی بەسەردا هات و شێوەیەکی بەدبینانەی وەرگرت.

### رۆمانسیزمی فەرەنسی

رۆمانسیزمی فەرەنسی لەژێر کاریگەرێتیی رۆمانسیزمی ئینگلیزی و ئەڵمانیدا چووزەرەی دەرکرد؛ ئەمەش لەو کاتەی کە شاتۆبریان ١٧٦٨ - ١٨٤٨ بۆ یەکەمین جار بەرهەمی نووسەرە ئینگلیزەکانی، هەروەها مەدام دو ستاییل بەرهەمی نووسەرە ئەڵمانییەکانی وەرگێڕایە سەر فەرەنسی. ئەمە جگە لەوەی بەرهەمەکانی ژان ژاک ڕووسۆ خۆیشی لە فەرەنسادا کاریگەریی هەبوو.

لە کاتی سەرهەڵدانی رۆمانسیزم لە فەرەنسادا، یەکسەر بەرهەمی نووسەرە ئینگلیز و ئەڵمانییەکانی وەک والتەر سکووت و ریچاردسن و یانک و گۆتە و شیلەر ناوبانگیان پەیدا کرد و بوونە سەرمەشقی لاساییکردنەوەی نووسەرانی فەرەنسی.

یەکەم بەرهەمی شیعریی رۆمانسیزمی فەرەنسی، کە رۆمانسیزمی پێ چەسپا، لە ساڵی ١٨٢٠ لە لایەن لامارتین١٧٩٠ - ١٨٦٩ بڵاوکرایەوە کە دیوانەشیعرێک بوو بە ناونیشانی (چەند ڕامانێکی شیعری Mediations poetiques ) کە سەرکەوتنێکی گەورەی وەدەست هێنا و نەوەی گەنجی رۆمانسیەکان بە رێبەری خۆیان لە قەڵەمیان دا. شیعری دەریاچەی تێدا بوو. ئەم هەڵبەستانەی لامارتین ئەوکات لەگەڵ رێبازی سەپاوی کلاسیکەکان یەک نەدەهاتنەوە.

لە بواری شانۆنامەشدا شانۆنامەیەکی ڤیکتۆر هووگۆ بوو بە ناونیشانی هێرنانی لە ساڵی ١٨٣٠دا، کە ئەویش وەک بەرهەمێکی رۆمانتیک پێشوازییەکی گەورەی لێکرا و سەرکەوتنێکی گەورەی وەدەست هێنا.

ئنجا پاشان رەخنەگری فەرەنسی، سانت بۆڤ Saint- Beuvee ، توانی بنەڕەتێکی تیۆری و ڕەخنەیی لە بارەی بنەماکانی رۆمانسیزم دابڕێژێت، وتی: "گوڵی شیعر لە ژێر پێی ئێمەدا دەکرێتەوە". مەبەستی بۆڤ لەم وتەیە ئەوە بوو کە ئێمەی رۆمانسی گوڵی شیعری کۆن و کلاسیک لە ژێر پێی خۆماندا دەپلێشێنینەوە و گوڵەشیعرێکی دیکە

(رۆمانسی) له جێگەی ئەم ڕەفزکردنەوەیەی کلاسیکدا دەرڕێتەوە.

له فەرەنسا نوێنەری فیکری رۆمانسیزم ژان ژاک ڕووسۆ بوو، کە ڕۆح و هەستە پڕ جۆش و خرۆشەکانی نەک تەنیا لە "دانپیانان" و "ئێمیل"دا، بەڵکو لە سەرتاپای بەرهەمەکانیدا دڵۆپەی رۆمانسییەتیان لێ دادەچۆڕا. بەرهەمەکانی ئەو بوونە سەرچاوەی هەرە گرنگی سەرهەڵدانی رۆمانسیزم لە فەرەنسا و ئەوڕووپادا، لە دوو ئاراستەوە: بیری تاکڕەوباوەڕی و هەستی سروشتی.

دوای ئەو لە فەرەنسا، بێرناردان دو سانت پییێر Benardin de Saint- Pierre شوێن پێی ئەوی هەڵگرت، ئنجا ڕەخنەگر سانت بۆڤ Saint- Beuvee ئینجا پاشان نووسەرانی وەک لامارتین و هووگۆ و ئەلفرێد دوڤینی و ئەلکزاندەر دووماس (باوک) و ئەلفرێد دومووسێ ١٨١٠ – ١٨٥٧. شایانی باسە، دوو نووسەری رۆمانسیی وەک مەدام دی ستایل ١٧٦٦– ١٨١٧ و شاتۆبریان ١٧٦٨–١٨٤٨ کە بە ڕووسۆ کارتێکراو بوون، دژی ناپلیۆن وەستان.

پەیڕەوکردنی ڕێبازی رۆمانسیزم لە لایەن داهێنەرانی فەرەنسییدا هێندە بەهێز و پڕ جۆش و خرۆش بوو کە لە کۆتاییدا ئەدەبیاتی ئەڵمانی و ئینگلیزیش کەوتنەوە ژێر تەئسیری ئەو فەرەنسییانە.

خانمێکی رۆمانسی لە ئەدەبیاتی فەرەنسییدا، بە ناوی ژۆرژ ساند George Sand ١٨٠٤–١٨٧٦، ناوی ڕاستەقینەی ئۆرۆر دیپان DUPIN بوو، لە ڕۆمانەکانیدا ژیانی چەوسانەوەی جوتیارەکانی دەردەبڕی.

ژۆرژ ساند ناوی نهێنیی ئەوە، چونکە ئەو کات جوان نەبوو کە ژن بەرهەمی ئەدەبی بڵاوبکاتەوە. زوو شووی کرد بۆئەوەی لە دەست کۆتی خێزان و ماڵی خۆیان دەربازی بێت، بەڵام ئەم شووکردنە – دوای دوو منداڵیش – ئەنجامەکەی گەیشتە تەڵاق و جودابوونەوە.

ژۆرژ ساند ئەو ژنە رۆماننووسەیە کە تێکڕای ئەوین و ئازار و حەز و خولیا و خەیاڵە ژنانەکانی خۆی دارشتبووە ناو ڕۆمانەکانی خۆی. دەیگوت: " ئێمە نەوەیەکی بەدبەختین، بۆیە لەم ڕووەوە ناچارین کە بە درۆکانی هونەر خۆمان لە واقیعی ژیان دووربخەینەوە". ئەم قسەیە دەکری بە یەکێک لە خاسییەتەکانی رۆمانسیزم بژمێردرێت.

لە ماوەی ژیانیدا کەوتووەتە چەندین پەیوەندیی خۆشەویستیی جۆراوجۆرەوە بەتایبەتی لەگەڵ هونەرمەندان و نووسەران: شۆپان، ئەلفرێد دو مووسێ. لە بەرهەمەکانیدا کە بەشی هەرە زۆریان ڕۆمانن و زیاتر لە پانزە ڕۆمانی نووسیوە، ئەو گیروگرفتە تراژیدی و ناهەموارانەی دەخستە ڕوو کە ئافرەت لە کۆمەڵگای تازەی فەرەنسادا لەگەڵ پیاودا و لە ژیانی خۆشەویستی و خێزانداریدا ڕووبەڕوویان دەبووەوە. ڕۆمانەکانی ئەو پڕن لە عەشق و هەست و سۆز و خەیاڵ و خەون و کۆستی ژنانە. لە بواری سیاسەت و ڕۆژنامەنووسیشدا کاری دەکرد. لە جوانترین ڕۆمانەکانی ئەو: " من و ئەو" ١٨٥٩، ئێندیانا ١٨٣٢، ڤالەنتین ١٨٣٢، لێلیا ١٨٣٣.

هەروەها ستانداڵ Stendal (١٧٨٣ – ١٨٤٢) کە هەندێ لە ڕەخنەگران دەیبەنەوە سەر ڕێبازی ریالیزم، بەڵام ستانداڵ بەرهەمەکانی بریتین لە رۆمانسیزمێکی ڕەخنەگرانە. هەر چۆنی بێ ڕۆڵێکی مەزنی بینی لە چەسپاندنی ناوەرۆک و بیری ڕەخنەگرانە لە ڕۆمانی فەرەنسیدا. شاکارەکەی ئەو «سوور و ڕەش» (١٨٣٠) هەروەها ڕاهیبەی پارما (١٨٣٩) بە ئەڵقەیەکی گرنگ دەژمێردرێن لە پەڕینەوەی رۆمانسیزمی ڕەخنەگرانە بەرەو ریالیزم.

## رۆمانسیزم له ڕووسیا

له ڕووسیا: ژوکۆڤسکی Joukovsky و پووشکین١٧٩٩ - ١٨٣٧ Poushkine :(زندانیی قەفقاس) و (نافوورەی باغچەسەرای) و (قەرەج) و (کچەئەفسەر)؛ هەروەها لیرمۆنتۆف: ئەهریمەن، ئالوا، پالەوانی سەردەمەکەمان، ڕۆلێکی گەورەیان هەبوو بەسەر پەیدابوون و بلاوبوونەوەی رۆمانتیسم.

پووشکین ئیلهامی له بایرۆن و شکسپیر وەرگرتبوو، لیرمۆنتۆفیش له بایرۆن و ئەلفرێد دوڤینی.

## رۆمانسیزم له سوێد

له سوێد: سەدەکانی ناوەڕاست" لەناو داهێنانی رۆمانسییەکاندا زیندوو کرایەوە. بۆیە ئەفسانە و هەلبەستە میللییەکانی ئەسکەندەنافییەکان له سالی ١٧٥٦دا بەباشی هاتنە ناساندن. له سوێد ڕاپەڕینێکی رۆمانتیکی بایەخدار سەری هەلدا. شاعیرێکی خەرابادی و بادەپەرست، بێلمان Bellman، چەند بەرهەم و شاکارێکی رۆمانسیی جوانی نووسی، هەروەها فێردمان Ferdman چەند نامەیەکی قافیەداری نووسی(سەعاتسازی ئەفسانەیی ستۆکهۆلم) که بریتییه له چەند دیمەنێکی کۆمێدی و عاشقانەی ژیانی خەلک له پایتەختی سوێددا. بەلام ئەو شاعیرەی که زۆر بەتوندییەوە یاسا و دەستووری کلاسیکەکانی خستە ژێر ڕەخنە و نەشتەرەوە تۆریلد Thorildبوو. تۆریلد لەژێر کاریگەرێتیی ژان ژاک ڕووسۆی فەرەنسیدا بوو، دەیویست که شیعر له وەسفی سروشت و بەیانکردنی هەست و سۆز زیاتر هیچی دیکە نەگرێتە خۆی. کتێبێکی لەم بارەیەوە بلاوکردەوە بە ناونیشانی (ڕەخنەی ڕەخنە). رۆمانسیزمی سوێدی لەم سێ نووسەرەوە و لەسەر دەستی دوو نووسەری دیکەوە بە ناوی تێگنەر Tegner و ئۆگزێنستێرنا سەری هەلدا.



لا مارتین

## هەندێ خاسیەتی رۆمانسییەکان

رۆمـانسـیـزمی ئەڵمـانی و ئینگلیـزی و فـەرەنسی، ئەگەرچی جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا بەدی دەکرێت، بەڵام لە خاسیەت و بنەما گشتییەکاندا یەکتر دەگرنەوە:

رۆمانتیکەکان هەست و سۆزیان لە سەرووی عەقڵەوە دەبینی و بە باشـتـر و جـوانتـریان دەزانی، هەروەها مـەیلێکی زۆریان هەبوو بۆ دەربڕینی خـەم و پەژارە و ماتەمین کە دواتر ئەم خەم و پەژارە و ماتەمینییە باڵیان کـێشـا بەسـەر هەمـوو ئەدەبیـاتی رۆمـانسـیـدا و بووە یەکـێک لە نیـشـانەکـانی. تەنیـایی و گـۆشـەگـیـری و ڕەشبینی خاسیەتی دیاری رۆمانتیکەکانن.

ئەوەی رۆمانسـییـەکان وەک رێباز هێنایانە ئارا ئەوە بوو کـە ڕاسـتـیـیـە بیـرییـەکـانیـان نەدەکـردە سـەرچاوەی دەربڕینەکـانیـان، ئەوان وایان دەردەبڕی کـە جـوانی ئاوێنەی دەربڕینی ئەو ڕاستییەیە. ئەم جوانییەشیـان لە هەموو توێژ و بەشێکی کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا دەبینی.

شیعر، لای ئەوان چەند ناسکتر و سادەتر و ئازادتر و دڵبـەندتر بووایە هێندە زیاتر دەچووە دڵەوە. شـیـعـری رۆمـانسی واتا و مـەبەسـتـەکـانی لە سنوورە دیاریکراوەکـانی ئەو سەردەمە دەربازکـرد. بڵاوترین بوار لە هەڵبەستی رۆمانسیدا "خۆشەویستی" بوو. گۆرانی و بەسـتـەیان دەکـردە هەوێن بۆ زۆر مـەبەسـتی گـرنگی خـۆیان. گـۆرانیـیـە فـۆلکلۆری و مـیللیـیـەکـانیـان بەکاردەهێنا بۆ دەربڕینی ڕووداوە ماتەمییەکان و گلەیی کـردن لە چەپۆکی دەسـتی گـەردوون. ڤـیکتـۆر هووگـۆ بەتوندی ڕووی ڕەخنەی کـردبووە شێـواز و ڕوخسـار و ڕەگەزە شیعرییەکانی ئەو کاتەی سەردەمی کلاسیزم، چونکە ژانرە شـیـعـری و جـۆرەکـانی شـیـعـر لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە، ڕەنگی سواوی و بێ ئومێدیی لێ نیـشـتـبـوو؛ لە سنووری بابەتە کـۆنەکـان زیاتر هیچ جـــۆرە هەنگاوێکی نوێی ئەوتۆی پێـــوە نەدەبینرا. رۆمـانسـیـیـەکـان لە ڕووی بڕگـە و ڕوخسـار و ئاوازی



تابلۆیەکی **رۆ مـانسی**

هەڵبەستەوە بەزۆری گرنگییان بە سۆنێت Sonnet دەدا، کە دوو شاعیری ئیتاڵی دانتی و بنزارین دایانهێنابوو و لە ٤ بەش پێکهاتبوو، ٢ لەو ٤ بەشە چوارین بوون کە هەر یەکەیان لە ٢ بەیت پێکهاتبوو، ٢ بەشەکەی دیکە سێیین بوون.

هەروەها رۆمانسییەکان ڕوویان دەکردە بیرکردنەوە لە باسە کۆمەڵایەتی و فەلسەفییەکان لە سنووری عاتیفەیەکی خۆییەوە.

لە ژیانی کۆمەڵایەتیشدا متووی ژیانی منداڵی و گوند و سروشت بوون، بۆیە زۆربەیان - هەم لە ژیان و هەم لە نووسین و داهێنانی هونەریدا - بەرەو باوەشی سروشت و گوند دەگەڕانەوە؛ ئەمەشیان وەک یاخیبوونێک دژ بە ژیانی جەنجاڵی ناو شار و شارستانییەت دەردەبڕی.

هەندێکیشیان شۆڕشگێڕانە دژ بە جیاوازیی چینایەتی دەوەستانەوە، داوای یەکسانی و ئازادی و ئاسوودەیی کۆمەڵایەتییان دەکرد، بەڵام ئەمە بەشێوەیەکی خەیاڵی و بە دەربڕینی هەست و سۆزی ناسک و ماتەمینبار، نەک بە دۆزینەوەی چارەسەری ئایدیۆلۆژی و بەرنامەدار.

مەیدانی ڕاستەقینەی زۆرانبازیی کلاسیزم و رۆمانسیزم شانۆنامە بوو، کە بە شانۆنامەی کرۆموێل Cromwell ی ڤیکتۆر هووگۆ ١٨٠٢ - ١٨٨٥ دەستی پێکرد، کە لە ١٨٢٧دا لەگەڵ پاشبەندێکی گرنگ بڵاوکرایەوە و کارێکی زۆریان کردە سەر گۆڕانی تێگەیشتنی فەرەنسییەکان لە بارەی شانۆ و بەرەو چەسپانی بیری رۆمانسیزم لە شانۆدا. دوای ئەویش چەند شانۆنامەیەکی گرنگی ئەلکزاندەر دووماس و ئەلفرێد دو ڤینی لە ١٨٣١ و ١٨٣٥ دا بڵاوکرانەوە.

لە شانۆی کلاسیزم تاکەکەس بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام رۆمانسییەکان بایەخیان بە تاکەکەس دا و لایەنە تایبەتی و دەروونییەکانی ژیانی تاکەکەسیان دەردەبڕی. ڤیکتۆر هووگۆ لە پاشبەندێکی کۆتایی



**ژۆرژ ساند**

ئەو ژنەی کە نازناوێکی پیاوانەی بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی خۆی هەڵبژارد - لە ترسی کۆمەڵگەی فەرەنسیی ئەوکات

شانۆنامەی کرۆمویل Cromwell دا، کە لە ١٨٢٧دا بڵاوکراوەتەوە و ئەم پاشبەندە بە مەرامنامەی رۆمانسیزم دەژمێردرێت، دەڵێ:"شانۆ ئاوێنەیەکە کە پێویستە هەرچی شتێکی لە دنیا و مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە دەبێ تێیدا ڕەنگ بداتەوە".

کلاسیکەکان بایەخێکی ئەوتۆیان بە ڕۆمان نەدەدا، بەڵام رۆمانسییەکان ڕۆمانیان بووژاندەوە و بایەخێکی زۆریان – لەچاو کلاسیکەکان – بە نووسینی دەدا. هەر لە سەردەمی رۆمانسییەکانیشدا بوو کە ڕۆمانی شەخسی Roman pesonnel و ڕۆمانی مێژوویی و ڕۆمانی عەشق و ڕۆمانی دەروونی سەریان هەڵدا. ئەمەش لە ئەنجامی بایەخدانی قووڵی نووسەرانی رۆمانتیک بە ژیان و تاکەکەس و عەشق و ڕووداوەکان و ڕابردوو. چیرۆکنووسی رۆمانسی هەتا پێی کراوە زیاتر لە خۆی دوواوە، لایەنە دەروونییەکانی خۆی بەشێوەیەکی ئاشکرا و بێ پەردە دەربڕیوە.

والتەر سکووت و لامارتین و ئەلفرێد دو مووسێ (دان پیانانەکانی کوڕێکی سەردەم) و ڤیکتۆر هووگۆ (ئاخرین ڕۆژی حوکم بەسەر دراوێک، کرێکارانی دەریا، خەندەلێو، بێنەوایان) هەروەها ژۆرژ ساند لە ڕۆماننووسە ناودارەکانی ڕۆمانسیزمن.

رۆمانسییەکان توانییان نوێخوازی وەک دیاردەیەکی تازە لە بواری شیعر و چیرۆکنووسیندا ئەنجام بدەن. رۆمانسییەکان ئەم گۆڕینەیان بەرپاکرد بێ ئەوەی دەنگی بێزاری و ناڕەزایی کلاسیکەکان ببێتە هۆی سلکردنەوەیان.

هەڵبەستە داستانییەکانی رۆمانتیکەکان لە باری بیر و هۆشەوە خەیاڵیتر و ئەفسانەییتر بوون لەچاو هی کلاسیکەکان. وەک خەون و تارمایی، سۆزی دەروونی زاتییانەی شاعیری رۆمانتیک، بەشێوەیەکی ئاشکرا دەبیندران، ئەمەش بە خۆ هاوێشتنە ناو مێژووی نیشتیمانی و کەلەپووری باو و باپیران و فۆلکلۆری دێرینیانەوە، بەپێچەوانەی کلاسیکەکان.سەرتۆپی ئەم



ژان ژاک رووسۆ

نووسەرانەش والتەر سکووت بوو.

لەو سەردەمە تازەیەدا نووسەر و هونەرمەند و شاعیران لە توێژە جۆراوجۆرەکانی خوارەوەی میللەت بوون. ژیانی میللی و هەستی نەتەوەییان دەردەبڕی و سوودیان لە کەلەپووری نەتەوەیی وەردەگرت لە ئەدەبەکەیاندا. لەم ڕووەوە، "سەدەکانی ناوەڕاست" داهێنانی ڕۆمانسیەکان زیندوو کرایەوە. بۆیە ئەفسانە و هەڵبەستە میللییەکانی ئەسکەندەناڤییەکان لە ساڵی ١٧٥٦دا بەباشی هاتنە ناساندن و لە ساڵی ١٧٥٦دا هەڵبژاردەیەک لە گۆرانییە میللییە ئینگلیزییەکان بڵاوکرانەوە. بەتایبەتیش قەشەیەکی ئینگلیزی، ماکفێرسۆن Macpherson، لە ١٧٦٠دا کۆمەڵێک پەخشانی ئاهەنگداری ئینگلیزیی بە ناونیشانی تەرجەمەی شیعرەکانی ئۆسیان Ossian، (کە شاعیرێکی سکۆتلەندی بوو لە سەدەی ٣ی زاینیدا دەژیا) بڵاوکردەوە. پاشان دەرکەوت کە بەشی هەرە زۆری ئەو شیعرانە نووسراوی خودی ئەو قەشەیە بووە. کاریگەرێتیی ئەم شیعرانە بەسەر سەرتاسەری نووسەرانی ڕۆمانتیکی ئەورووپی شتێکە ئینکار ناکرێ. بۆ نموونە گۆتەی شاعیری ئەڵمانی کە ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لە دامەزراندنی بنەماکانی ڕۆمانسیزم لە ئازارەکانی ڤارتەر" دا بەشێک لەو شیعرانەی ماکفێرسۆنی تەرجەمە و نەقل کردووە. هەروەها مەدام دو ستاییێلی فەرەنسی، هاندەر و بڵاوکەرەوەی ڕۆمانسیزمی فەرەنسی، ئەم شیعرانەی ماکفێرسۆنی لە هەموو بەرهەمەکانی هۆمێری کلاسیک بە جوانتر و پایەدارتر لە قەڵەم داوە.



**شۆپان**

مۆسیقاژەنی ڕۆمانتیکی پۆڵۆنی

لە ئەڵمانیاش ئەدەبیاتی سەدەکانی ناوەڕاست بووە جێی سەرنجدان و لێ وردبوونەوە. لە ئیسپانیا گۆرانییە میللییە کۆنەکان و لە فەرەنسا شیعرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست زیندووکرانەوە. بەرهەمەکانی شکسپیر

بەتایبەتی لە ئەڵمانیا ڕەونەق و ڕەواجێکی زۆری پەیداکرد، لە ئیتاڵیاش دانتی تازەبووەوە. هەروەها ئەدەبیاتی ئینگلیزیش لەم بوارەدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا.

### ڕۆمانسیزم لە هونەردا

ڕۆمانسیزم لە هونەری نیگارکێشیدا دژی نواندنی ئەکادیمییەت و کلاسیزم دەوەستێتەوە و لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمدا سەرکەوتنێکی تەواو وەدەست دەهێنێ. ئەمەش بە هۆی ئەو دەربڕینە هونەرییە ڕەمەکی و یاخیگەرانەی (کە گۆیای ئیسپانی Goya بڵاوی کردەوە) دژی ئەو ساردی و عەقڵخوازییەی کە لە نیگاری کلاسیکەکاندا فەرمانڕەوا بوو.

ئەو گۆڕانکارییانەی کە بە هۆی شۆڕشی فەرەنسا ڕوویاندابوو تاکەکەسیان ڕووبەرووی خۆی و واقیعێکی تازە کردبووەوە، ڕووبەرووی کابووس و خەون و ئازارە تایبەتیە شەخسییەکانی.

ژێریکۆلت Gericault ئەم بابەتانەی دەردەبڕی. تەنیایی، شەو، ترس، ئازار، ناخۆشی.

مردن تێکەڵ بە کولتوور و ڕووناکی و خۆشییەکانی ژیان ببوو لای هونەرمەندی ڕۆمانسیدا. هەروەها نیگارکێشە ئینگلیزەکانیش، وەکو توورنەر Tourner، کۆنستابل Constable، بۆنینگتۆن Bonington ڕوویان کردە نیگارکێشانی سروشت و دیمەنە سروشتی و کێوییەکان، هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی خەیاڵی بەبڕشتی خۆیاندا. ئەمەش تازەهاوردێک بوو لە بواری بینینی شێوەکاریدا و بەتایبەت لە بواری بەکارهێنانی (ئاکوارێل)ئاوڕەنگدا.



هوگۆ

لە نیگارکێشانی ڕۆمانتیک: ولیەم بلاکی W. Blake ئینگلیز، فریدریکی Freidrich ئەڵمانی. لە فەرەنساش: یۆژین دولاکروا DELACROIX، ئووبێرت ڕۆبێرت H. Robert، گرۆ Gros، ژێریکۆلت.

له بواری مۆسیقاشدا مۆسیقاژەنان پەیوەندیی خۆیان بە ئیقاعی کلاسیک پچڕی و ڕوویان کردە دەربڕینی مۆسیقایی سۆزاوی و دەربڕینی بیر لە ڕێگای زمانی مۆسیقاییەوە. هەر بۆیەش گۆرانییە میللییەکان پەرەیان زیاتر سەند و تێکەڵ بە مۆسیقای هاوچەرخ بوون، ئەمەش لەسەر دەستی شوبێرت Schubert ؛ هەروەها پیانۆش بڵاوبووەوە و پەرەی سەند، ئەمەش لەسەر دەستی شۆپان Chopin، هەروەها بۆیە ئۆرکێستراش پەرەی زیاتر سەند و بڵاوبووەوە لەلایەن بێرلیۆز Berlioz و درامی لیریکیش لەلایەن واگنەر Wegner و ڤێردی Verdi.

## بنەما و دەستوورەکانی ڕۆمانسیزم

ڕۆمانسییەکان لە بارەی بنچینە و دەستوورەکانی خۆیان بیروڕای دژ بەیەک و ناکۆکیان هەیە. ئەم پرەنسیپانەی خوارەوە هەرە دیار و گرنگەکانن:

### ١- ئازادی



تابلۆیەکی **ڕۆمانسی**

ساڵی ١٨٣٠ (کە ساڵی بڵاوبوونەوەی شانۆنامەی هێرنانیی ڤیکتۆر هووگۆیە) بە ساڵی شۆڕشی ڕۆمانسیزم دەژمێردرێ لە فەرەنسا، چونکە لەو ساڵەدا هووگۆ و برادەرەکانی لە گۆڤارێکی خۆیاندا ڕۆمانسیزمیان بە سیفەتی ئازادیی هونەر و تاکەکەس ناساند.

بە لای ئەم گەنجە ڕۆمانسییانەوە، ئەوەی کە ئیلهام دەبەخشێت و بە مانای ژیان لە قەڵەم دەدرێ: " ئەڤین و هۆگرییە". ئەم ئەوین و هۆگرییە پێویستە ئازاد بێت. هونەرمەند مافی ئەوەی هەیە کە لەبارەی کۆمەڵ و قانوونە ئەخلاقییەکان داوەری بکات و بیروڕای هەبێ، ئەمەش لەپێناو هێنانەئارای زەمینەیەکی پێشکەوتووتر. ئەدەب و هونەر نابێ بە قانوونی ئاوها ببەسترێنەوە کە عەشق و هۆگری و پەیوەندی و خەیاڵ سنووردار بکەن.

ئەدەبیات و هونەری ڕۆمانسی، بەپێچەوانەی ئەدەب

و هونەری کلاسیزم، دەتوانن هەموو کێشەیەکی ژیان، چ جوان چ ناشیرین، چ بەرز چ نزم، چ باش چ خراپ بکەنە بابەتی دەربڕین و لێکۆڵینەوەی خۆیان؛ سوود لە هەموو قۆناغ و هەموو دیمەنێکی ژیان و مرۆڤ و کۆمەڵ ببینن بۆ پیشاندان: واتە باسکردنی ژیانی هەر دوو چینی سەرەوەش و خوارەوەش.. نەک تەنیا دەربڕینی ژیانی چینی سەرەوە، وەک لای کلاسیزم باو بوو.

بەم شێوەیە، رۆمانسییەکان پێش ریالیستەکان، یەکەمین کەسانێک بوون توانییان تا رادەیەک دابەزنە ناو چینی خوارەی کۆمەڵ.

جاران، واتە لە سەردەمی کلاسیزمدا، ئەم ئازادییە نەبوو کە نووسەر بێت لە مەرگەساتی چینی خوارەوە بدوێت: چونکە ئەمە واتای ئەوەی دەگەیاند کە نووسەر و هونەرمەندی کلاسیک هەرەشە دەکاتە سەر بەرژەوەندییەکانی چینی باڵا و تێکدانی چێژی سەپاو.



لۆرد بایرۆن

ئەدەبی کلاسیکەکان لە خزمەتی چینی ئەرستۆکراتیدا بوو. جەماوەرێکی کەمی هەبوو. لە سەدەی ڕێنسانسدا کۆمەڵەی نووسەرانی چلچرا Pleiade کە ٧ نووسەری فەرەنسی بوون لە سەردەمی هینریی دووەمدا ١٥٤٧-١٥٥٩ ئاشکراتر لە کلاسیکەکان داوای بە سووک سەیرکردنی عامەی خەڵکیان دەکرد و هونەریان تەنیا بە هی دەستەی هەڵبژاردە دادەنا. رۆمانسییەکان لەمەدا بەتەواوەتی پێچەوانەی کلاسیکەکان بوون.

بیری ئازادی، هەر لە سەردەمی ڕێنسانس بەملاوە، وەک سەرەتایەک بۆ سروشتی تاکڕەوباوەڕی دەست پێدەکات. بەمەش سروشتێکی تاکەکەسییانە وردە وردە دەنووسێتە سەر بیر و بۆچوون و ڕاستییەکان. لێرەوە، بیر و بۆچوونەکان دەشێ قووڵ بن، بەڵام مەرج نییە ڕاست بن: گرنگ ئەوەیە بەگوێرەی کەسەکە خۆیەوە ڕاستگۆن. لێرەشەوە، هونەرمەند توانای خۆی و ئازادیی خۆی وەدەست دێنێتەوە. بۆیەش مافی خۆیەتی لە هەموو شتێک تێ بگات.

ئەو ئافرەتەی کە ئاڵای فەرەنسای بەرز کردووەتەوە و

وەپێش کۆمەڵێک شۆڕشگێڕ کەوتووە (کە تابلۆیەکی یۆژین دی لاکروا)یە، بەیەکێک لە تابلۆ رۆمانسیە ناودارەکان دەژمێردرێت و نیشانەکانی ئازادی و ئازادبوونی تێدا دیارە، لە هەموو روویەکی هونەری و ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.

## ٢- تاکەکەسی و تاکڕەوی Le Moi

هونەرمەندی رۆمانتیک فەرمانڕەوایەتیی من لە هونەردا دەچەسپێنی و تاکڕەوێتی لە جیاتی کۆمەڵڕەوی دادەنێ: خولیا و کەڵکەڵە و بیر و ئارەزووەکانی خۆی بەیان دەکات. جاران هونەرمەندی کلاسیک ئەگەر بیویستایە مرۆڤێکی کۆمەڵخوازی وەسف بکردایە دەهات شەخسییەتێکی لە مێژوو یا لەنێو ئەفسانەیەکەوە هەڵدەبژارد، بەڵام هونەرمەندی رۆمانتیک خودی خۆی لە جیاتی ئەو شەخسییەتە مێژوویی یان ئەفسانەییە هەڵدەبژارد و خۆی دەکردە نموونەی هاوجۆرانی خۆی.



ئەلفرێد دو ڤینی

فەیلەسووفی فەرەنسی، مۆنتاین، یەکێک لە یەکەمین فەیلەسووفەکانی تاکڕەوباوەڕی لە سەردەمی رێنسانسدا، جوان بیری تاکڕەوباوەڕی روون دەکاتەوە و دەڵێ: «من بەجەسارەتەوە گۆشەنیگای خۆم دەردەبڕم (چونکە، بیر، پێش هەموو شتێک، گۆشەنیگایەکی شەخسییە و سروشتێکی تاکەکەسییانەی هەیە. رای من لەبارەی شتەکان نابێتە پێوەر بۆ شتەکان، تەنیا وەک پێوەرێکی بینینی تایبەتی من بۆ شتەکان حسێبی بۆ دەکرێت. من ئەوەندەم بەسە کە بۆ پێشکەشکردنی مەعریفەیەک، پێشبینیی خۆم وێنا بکەم. هەر لە رێگەی ئەمەشەوە پێشبینییەک – لە بارەی شتەکانەوە نا – لە بارەی خۆم دەردەبڕم. سروشتی ئەو مەسەلانە گرنگ نین کە دەریان دەبڕم، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە من بە چ رێگایەک و چۆن دەڕوانمە مەسەلەکان».

بەم شێوەیە، ئەم بۆچوونە تازەگەرەی نووسەرانی سەردەمی رێنسانس کە مۆنتاین یەکێک بوو لەوان،

زەمینەی خۆش کرد بۆ رۆمانسییەکانی سەدەی دواترکە بەتەواوەتی ئازاد بن و ئازادانە بیــر بکەنەوە: باوەڕی زیاتر بە توانا و ڕۆڵی تاکەکەس بهێنن.

ئەم بۆچوونەی مونتاین، تەنانەت بەگوێرەی سەردەمی رێنسانسیشەوە تازە بوو: جارێ هێشتا سرڤانتس و شکسپیریش تێگەیشتنی جیهان و ڕووبەڕووبوونەوەیان لە چاوی پاڵەوانەوە تەماشا نەکردبوو. لەو سەردەمەدا، پاڵەوانەکانی شکســپیــر تازە دەســتیــان پێ کــردبوو شوێنپەنجەی تاکەکەسیانەی خۆیان بەسەر دنیاوە بەجێ دەهێشت.

لە سەرەتادا بینینی شەخسی و گۆشەنیگای تاکڕەوانە بۆ جیهان وەک شزووزێک و تەنانەت موستەحیل دەهاتە بەر چاو. لەپێناو دەربڕینی دنیای ناوەوەی تاکەکەس لە جیاتی هەمیشە بەرچاوخستنی دنیای دەرەوەی بابەتی، مەرجێک هەبوو: خەونێک کە لە رێگەیەوە خواوەند هوشیــارییــەکی لە مــێشکی مــرۆڤــدا - لە مــێشکی هونەرمـــــەندا - دروست بکردایە (وەک خـــــەونی کۆمێدیای حواوەندانەکەی دانتی)، یانیش دروستبوونی وەهم و جۆرێک لە شێتایەتی (وەک لای دۆن کیشۆت دەبینین). بێگومــان ئەم خــەون و وەهم و هەلوەســە و شێتایەتییەش، وەک هوشیاربوونەوەیەکی تاکەکەسیانە وایە کــە تازە خــەریکە گــەراکــانی خــۆی لەناو بیــری ئەورووپیدا دادەنێ.

بەم شێوەیە دەبینین تراژیدیا - لە شانۆنامە و چیرۆک و رۆمــانــدا- ئەگــەر لای کــلاســیــزم تراژیدیای چینی ئەرستۆکرات بێت (یۆلیۆس قەیسەر، شا لیر..)، دەبینین تراژیدیا لای رۆمانسییەکان دەبێتە تراژیدیای تاکەکەس (ئازارەکانی ڤارتەر).

هەر لە ئەنجــامی ئەم بایەخـــدانەش بە خـــود و بە تاکــەکــەس، دەبینین لای رۆمــانســیــیــەکــان هونەری بایۆگــرافــیــا پەرەدەســتــێنێ و و ژانری ژیاننامــە دەبووژێتەوە.


ئەلفرێد دوو مووسێ

### ٣- هەڵچوون و سۆز و خرۆش

دەبێ بزانرێ، لای رۆمانسییەکان، لەپاڵ عەقڵدا، دڵ و هەست و سۆزیش دنیایەکی تایبەت و سەربەخۆی هەیە. لای مرۆڤ هەست و نەست پێش فیکر و عەقڵ دەکەوێت؛ هەروەها ئارەزووش زیاتر لە هەقیقەت کاریگەرێتیی هەیە. لەم رووەوە، بە رای رۆمانسییەکان، پێویستە هەست و هەوەسەکانی رۆح، پێشچاو بخرێن و لێیان بکۆڵدرێتەوە. ئەلفرێد دی مۆسیێ دەیگوت: ''ئێمە دەبێ ورێنەکانیشمان بنووسین!''. واتە دڵ دەبێ بێ قەید و بەند هەرچی شتێکی حەزدەکا بیڵێ، بیلێت.

دەربڕینی خەم، خەون، ئازادی، سۆز، سۆز و هەستە خرۆشەکان، تەنیایی و خەڵوەت و خۆشەویستی.. بابەتە دیارەکانی رۆمانسیزمن. لە ئەنجامی ئەم بایەخدانەی نووسەری رۆمانسی بە دەروون، لە ئەنجامی ئەم رۆچوونەی هونەرمەندی رۆمانسی بەناو کانگای تاکەکەسدا، دەبینین هونەر لە رووی دەروونناسییەوە دەوڵەمەندتر دەبێت: ئەدەب قووڵاییەکی سایکلۆژیی بەبڕشت پەیدا دەکات.

نموونەی چەند کۆپلە شیعرێکی رۆمانسییانەی ئەلکزاندەر پووشکین، شاعیری گەورەی رووسیا، - بە وەرگێڕانی عەبدوڵڵا پەشێو:

١

ئەگەر ژین درۆی لەگەڵدا کردی
خەفەت مەچێژە و دڵت نەرەنجێ
لە رۆژی رەشا باوەڕت وابێ
کە هێندە نابا خەونت دێتە جێ.

٢

دڵ بۆ دوارۆژ لێ دەدا
ئێستا مرۆڤ خەم و ژانە
هەرچی هەیە رادەبوورێ
رابردووش هەمیشە جوانە.

پاشکۆی عێراق ژ ٤٥ ساڵی ١٩٨١

بەشێک لە هۆنراوەی

**" ئەو ساتە خۆشەم هێشتا لەبیرە"**

لە تەنیاییدا، لە بەندیخانەی ئەنگوستەچاودا
ڕۆژانی ژینم تێپەڕین بێ دەنگ بێ خواپەرستی
بێ ئیلهام، بێ ژین
بێ فرمێسکی گەش، بێ خۆشەویستی.

کە تۆ سەرلەنوێ وەک ئیدیالێکی ناسکی بێگەرد
خۆت پێ نیشاندام
گیان لە خەو ڕابوو، خەونەکانیشم
گەڕانەوە لام.

و: پەشێو، پاشکۆی عێراق- شوبات و ئاداری ١٩٧٨



ئێمانوێل کانت

**٤- گەشت و گەڕان و ڕاکردن لە شار:** بەرەو سروشت، ڕابردوو، منداڵی

تلانەوە بە دەست ئەو شوێن و کاتەی کە هونەرمەندی ڕۆمانسی تێیدا دەژی، هەروەها ئارەزووی ڕاکردن بەرەو شوێن و کاتێکی دیکە، بەتایبەتی - بە خەیاڵ - بەرەو سەردەمی منداڵی و سەردەمە کۆنەکانی چاخەکانی ناوەڕاست یان - بەڕاستی - بەرەو گوند و باوەشی سروشت خاسییەتێکی دیار و گرنگی بیرکردنەوەی ڕۆمانسییەکانە. هەر بۆیەش زۆربەی ڕۆمانسییەکان حەزیان لە گەشت و گەڕان و سەفەر دەکرد. شاعیرانی ناوداری فەرەنسی، لامارتین و شاتۆبریبیان و پییێر لۆتی (١٨٥٠ - ١٩٢٣) و ژیرار دو نێرڤال (١٨٠٨ - ١٨٥٥) هاتنە ئێران و تورکیا و سووریا و کوردستان و میسر (لامارتین لە سەدەی نۆزدەمدا یەکەم شاعیری فەرەنسایە کە ناوی کوردستانی هێنابێ). ئەم نووسەرە ڕۆمانسییانە بەرهەمەکانی خۆیان بە ڕۆژهەڵات دەوڵەمەند کرد.

ئەلفرێد دی مووسیێ چووە ئیتالّیا، گۆتێ چووە ئیسپانیا و ڕووسیا و ئیتالّیا، ئەلکزاندەر دووماس چووە ئیتالّیا و ئیسپانیا، بایرۆن لە جەنگی یۆنان کوژرا.

کەواتە، مەنزلّگەی ژمارەیەکی زۆری ڕۆمانسییەکان لەم سەفەر و گەشت و گەڕانەی خۆیاندا: ولاتانی ڕۆژهەلات بوو. نووسەری ناوداری ڕۆمانسیی ئەلّمان، فریدریک شلێگلّ، دەیگوت: «ئێمە لە ڕۆژهەلاتدا دەبێ بۆ بەرزترین نموونەی ڕۆمانسییەت بگەڕێین».

کەواتە، ڕووکردنە ڕۆژهەلات و سوود وەرگرتن لە جیهانی ڕۆژهەلات بنەمایەکی ڕۆمانسیزم بووە، هەر بۆیەش بەرهەمەکانی پووشکین و لامارتین و گۆتە و بایرۆن و هووگۆ هێندە بەهۆی ئەزموونەکان و دنیای ڕۆژهەلاتەوە دەولّەمەند کران.

ڕۆمانسیزم، بەم شێوەیە، لە هونەر و ئەدەبیاتی ئەورووپادا، یەکەمین کرانەوەی مەزن بوو بەرەو ڕۆژهەلات. وەک ڤیکتۆر هووگۆ دەلّێ: «ئێمە لە سەردەمی لویسی چواردەمدا نێهیلیست بووین، بەلام ئێستا ڕۆژهەلاتناسین».



ڕوسۆ

بایەخدانی شاعیر و نووسەرە ڕۆمانسییەکان بە ڕۆژهەلات لە سەدەی نۆزدەمدا گەیشتە ئەوپەڕی پێشکەوتن. وێڕای ئەم بایەخدانە، نیگارکێشەکانیش، بە ڕۆلّی خۆیان، ڕوویان کردە ولاتانی ڕۆژهەلات، ڕیشەی هونەریی خۆیان بەناو خەلّک و سروشتی ڕۆژهەلاتدا ڕەگاژۆ کرد. تەنانەت ڕەسمکردنی دیاردە و بابەتەکانی ڕۆژهەلات لەلایەن نیگارکێشە ڕۆمانسییە ئەورووپییەکانەوە، لە سەدەی نۆزدەمدا بووە قوتابخانە و ڕەوتێکی هونەریی سەربەخۆ. ئەم قوتابخانە هونەرییەی نیگارکێشانیش، ئەمڕۆ بە ناوی ڕۆژهەلاتناسی Orientalisme ناسراوە.

نیگارکێشی ڕۆمانسیی فەرەنسی، یۆژێن دی لاکروا، چووە جەزایر. ژێریکۆلّت بۆ تورکیا و ئێران. پووشکین چووە ئەرزەڕۆم و باسی کوردە یەزیدییەکانی کرد.

شاعیری گەورەی ئینگلیزیش، بایرۆن، چووە یۆنان و لە جەنگی سەربەخۆیی یۆناندا شەهیدبوو. تەنانەت گەلێ لە گەورە نووسەر و ڕۆماننووسە ریالیستەکانیش، بۆ نموونە گۆستاف فلۆبێرت، شەیدای ڕۆژهەلآت بوون، بەهرەی بەرهەمەکانی خۆیان لە میسر و ئێران و تورکیاوە هەڵدەهێنجا.

ئەم نووسەر و هونەرمەندە ڕۆمانسییانە باوەڕیان وابوو کە کۆمەڵگای ئەورووپی کەوتووەتە خەرەندێکی قووڵەوە، مرۆڤ نرخی مرۆڤانە و بەهای ڕۆحیی خۆی لە دەست داوە. ژنی ئەورووپی بە هۆی کارکردن لە ناوەندە پیشەیی و دەوڵەتییەکان و لە کارگەکاندا هەروەها بەهۆی زێدەڕۆیی لە چوونە دەرەوەیدا، ناواخن و ڕۆڵی سروشتیی خۆی لە دەست داوە. بەم شێوەیە، خێزان، کە کۆڵەگەی کۆمەڵگایە، بە بۆچوونی ئەم ڕۆمانسییانە، داڕووخاوە.

لامارتین، شاعیری گەورەی ڕۆمانسیی فەرەنسا، یەکێک بوو لەو ڕۆمانسییانە، کە وای دەبینی سیستەمی ژیانی ڕۆژئاوایی بەرەو ڕووخان هەنگاو دەنێت، بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، وای دەبینی کە ڕۆژهەلآت لانکەی لەدایکبوون و بووژانەوەیە. لەم بارەیەوە دەڵێ: " ڕۆژهەلآت شانۆی شکۆمەندترین مرۆڤە".

لامارتین دەگاتە ئەو ڕایەش کە " شارستانییەتی ڕۆژهەلآت هەمیشە لە سەرووی شارستانییەتی ڕۆژئاوادایە، چونکە دێرینترە، ڕەسەنایەتییەکەیشی سازگارتر و ڕسکاوترە". ڕووناکبیرێکی فەرەنسی، فرانسواز بێرەنژێ، ئەم شەپۆلەی ڕووکردنە ڕۆژهەلآت لەلایەن شاعیر و نووسەر و هونەرمەندانی ئەورووپییەوە، لێکدەداتەوە و دەڵێ: "ڕۆژهەلآت پەناگەی ئەو کەسەیە کە سەرنەکەوتووە لە خۆگونجاندنیدا لەگەڵ واقیع".

نیگارکێشە ڕۆمانسی و ریالیستە ئەورووپییەکانی سەدەی نۆزدەم، شەیدای سەفەر و جوانی و غوربەت و



رووسۆ

عەشقی ڕۆژهەلات، بە دەیان ساڵ لە دەشت و دەر و شار و پایتەختە بەر هەتاوەکانی ڕۆژهەلات ماونەتەوە و ڕەسمی ڕووبار و کچ و شار و شاخ و شەوی ڕۆژهەلاتیان کردووە، بەدەم وێنەکێشانی جوانییەکانی ڕۆژهەلاتەوە ژیانیان بەسەربردووە. کە گەڕاونەتەوە ولاتی خۆشیان ئەو تابلۆیانەیان لە ئەکادیمیا و مۆزەخانە و گەلەری و پەیمانگا و ساڵۆنە هونەرییەکاندا هەلواسیوە بۆئەوەی خەلک بیانبینێت و بەو جوانییە دەگمەنانە سەرسام بن و دڵخۆش بن. ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر لەو تابلۆیانە لە مۆزەخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا لە پاریس پارێزراون، ئەو مۆزەخانەیەی لە ساڵی ١٨٩٠دا دامەزرا و لە ساڵی ١٨٩٣دا پێشانگەیەکی تەرخانکراوی تەنیا لەبارەی تابلۆی ڕۆژهەلاتناسەکان پێشکەش کرد.

ئەو نیگارکێشە ڕۆمانسییانەی کە لە سەدەی نۆزدەمدا هاتوونەتە ڕۆژهەلات و ڕەسمی جوانیی ڕۆژهەلاتییان کردووە، ناودارترینیان ئەمانەن:

- نیگارکێشی ڕۆمانسیی فەرەنسی، یۆژین دی لاکرِوا، کە چووبووە جەزایر و باکوری ئەفریقا.
- نیگارکێشی ناپۆلسی، تۆماس ئیرنست، کە سالانێکی زۆر لە ئەستەمبۆڵ و مەراکش ژیابوو.
- نیگارکێشی ئینگلیزی سەردەمی ڤیکتۆری، جاسێریۆ، کە چووبووە میسر و باکووری ئەفریقا.
- نیگارکێشی ڕۆمانسیی ئینگلیز، ئۆجین فرۆمێنتێن، کە بەشێکی ژیانی خۆی لە میسر بەسەربردبوو.

بە هەمان شێوە، سروشت و منداڵی پانتاییەکی فراوانیان لە ئەدەبیاتی ڕۆمانسیدا داگیر کردووە، چونکە ئەم دوو جیهانە: پاک و " بەهەشتی" و ئارامن، شاعیری ڕۆمانتیک بوونی خۆی تێیاندا دەدۆزێتەوە.

ولیەم بلیک ١٧٥٧- ١٨٢٧ نیگارکێش و شاعیری ڕۆمانسیی ئینگلیز، لە شیعرەکانیدا دەگەڕایەوە بۆ منداڵی و جیهانە جوان و بێگەردەکەی. دی مووسیێ خۆشیی لەوە وەردەگرت کە بگری بەسەر وێرانەی دلداریدا. دلی بەوە دەکرایەوە کە فرمێسک ببارێنی بۆ کۆنەیار، بەسەر کاولەهەوار.

بەم شێوەیە، ڕۆمانتیکەکان بەگشتی عاشقی ڕابردوو بوون. بۆ نموونە لای دی مووسیێ، گوتنی "یارێکم هەبوو" زۆر خۆشتر بووە لە "یارێکم هەیە".

نموونەی شیعرێکی ڕۆمانسییانەی ئەلفرێد دی مووسیێ، شاعیری گەورەی فەرەنسا:

دوێنێ ئارەزووی گریانم دەکرد
تەزووی پیادەهات دلەی نامراد
هەرکە بیری تۆ و سەردانم دەکرد
هەوارگەی پیرۆز کۆنە گلکۆی یاد

سەیری ئەو گرد و هەرد و بەیارە
سەیری ئەو زیخەی بەر پێلی زیوین
سەیری بزنەڕێی ناو شاخ و دارە
جێی دەس لەملانێ و قسە و پێکەنین

چیان بەسەر هات، ناخۆشیی ژیان
کە پیریان کردم پشتم بوو چەماو
ئۆخەی پیرەدۆڵ دۆستەکەی هاوگیان
کە تۆ دەبینم دەمکەیتەوە لاو

من بە چاوی خۆم بینیم تاکەیار
شۆڕ دەکرێتەوە ناو گۆڕێکی ڕەش
گۆڕێکی تاریک تێیدا مشک و مار
ئەو لەشە نەرمەی دەگرنە باوەش

دەبا بەسەرما بکەوتە خوارێ
قورسایی ئاسمان پانم کاتەوە
چۆن خنکاو دەگرێ توند شەپکەدارێ
هێز نییە من لە یاد جیا بکاتەوە.

و: عومەر دزەیی، کاروان ژ ١٠

**٥- دۆزینەوە و بینین:**

نووسەری رۆمانسی بەدوای دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیان و دنیادا دەگەڕێت. ڕەخنەگری فەرەنسیی سەدەی ١٩م، سانت بۆف، ناو لەم دیاردەیە دەنێت " ئارەزوویەکی مەزن بۆ دۆزینەوەی نەدۆزراوە و نەناسراوەکان". هونەرمەندی رۆمانتیک خەیاڵ و ئومێد و پەرجوو لە جێی ڕاستی دادەنێت، زیاد لەوەی کە هەیە پابەندی پێشبینی و خەیاڵە. هونەرەکەی تێکەڵ بە موبالەغە (زێدەڕۆیی) دەکات، واتە لەو شتانە دەکۆڵێتەوە کە بوون نایلێت و پێویستە هەبێت. بەکورتی رۆمانسیەت جۆرێکە لە "دەروونبینی".

بۆیە، ئەگەر ئەدەبیاتی کلاسیک دۆزینەوە و موغامەڕاتی تێدا نەبووبێت، ئەوا ئەدەبیاتی رۆمانسیزم تژییە لە سەرکێشی لادان و دۆزینەوەی نوێ.

**٦- مەسیحییەت:**

خاسیەتێکی دیکەی رۆمانسیزم هەبوونی باوەڕی دینی مەسیحی و ڕەنگدانەوەی بیری مەسیحییە لەناو بەرهەکانیاندا.

فەیلەسووفەکانی سەدەی ١٨م لە ئەورووپا دژی دین ڕاپەڕیبوون، رۆمانتیکەکان بەپێچەوانەی ئەوان مەسیحییەتیان وەک پێویستییەکی دەروونی لە دڵدا زیندوو بووەوە. بۆیەش هەڵبەستی فەلسەفەی دینی – کە تارایەکی ڕەنگاوڕەنگیان بەسەر دادابوو– لای رۆمانتیکەکان شوێنی شیعرە زانستییەکانی کلاسیکەکانی گرتبووەوە. تەنانەت لە شیعرەکانیاندا گەلێک جار سۆفیگەرییانە باسی سروشتی گەردوونیشیان دەکرد.

ڕۆمانتیکەکان لە ڕێگای هەست و نەستەوە بەرەو " باوەڕ" دەڕۆیشتن، بەڵام هەندێ جاریش بەرەو یاخی بوون، بۆ نموونە چامەکەی لامارتین، La chutte d un ange 1838 هەرەسی فریشتەیەک، بۆچوونێکی فەلسەفیی مرۆڤ دەردەبڕێ لە هەمبەر جیهانی ئاسماندا، واتە لە هەمبەر ئەو خوێنڕێژی و زۆر و ستەمەی کە لەلایەن مرۆڤەوە بەرامبەر مرۆڤ دەکرێ. لامارتین هەڵدەشاخێ و یاخی دەبێ.. کفر دەکات. سزای ئەو ئازار و مەینەتییە بە تۆفانێک نیشان دەدات، بۆ پاککردنەوەی زەوی لەو مرۆڤایەتییە ئاژەڵییەی کە هەیە؛ ئەو ئاژەڵییە دەکاتە ئاکارێکی نالەباری خودی مرۆڤ خۆی کە پێویستە بەم تۆفان و سێلاوە لە بێژنگ بدرێت و تەتەڵە بکرێ: بۆ گۆڕینێکی باشتر و مرۆڤایەتیەکی گونجاوتر.

شاتۆبریبان دینی مەسیحییەتی زۆر خۆش دەویست، چونکە لای ئەو شاعیرانەترین دین بوو. هەر بۆیەش یەکێک لە بەرهەمەکانی خۆی ناو نا " بلیمەتێتیی مەسیحییەت". ڕۆمانتیکێکی ئەڵمانیش، فرێدرێک شلێگڵ، لە کتێبی مێژووی ئەدەبی نوێ و کۆندا، میوونخ ١٩٦١ ل ٢٨٤ دەڵێ: «مەسیحیترین نووسەر ڕۆمانتیکیترین نووسەرە».

**٧ - خەم و پەژارە و ونبوون:**

ڤیکتۆر هووگۆ بەرهەمێکی خۆی Comtemplatoins ناوناوە "بیرەوەرییەکانی ڕۆحێک". باشتر وایە ئەم ناوە بە هەر هەموو بەرهەمە ڕۆمانتیکییەکان بڵێین. لە شیعرەکانی ئەم دیوانەدا گەڵای زەردی پایز، ئاهەنگی غەماوی، خۆرئاوابوون و تاریکی فەرمانڕەوان. ئەم دیاردانە، وێڕای تەنیایی و خەڵوەت و ئازاری ڕۆح، هەمان لایەنە دیارەکانی مەسیحیەتن کە لای ڕۆمانتیکەکان دووپات دەبنەوە. ژیانی دوای شۆڕشی فەرەنسا شاعیری ڕۆمانتیکی ڕووبەڕووی دنیایەکی تازەی نامۆ کردەوە. شاعیری ڕۆمانتیک هەستی بە ونبوون و سەر لێ شێوان دەکرد بەرامبەر ئەو دنیا تازەیە، هەستی دەکرد دنیای ڕاستەقینەی ئەو لەدەست چووە و ئیدی ئەو دنیایە ناگەڕێتەوە. بۆیە خەم و نیگەرانییەکی قووڵ دڵی دەڕنێت.

بابەتی ڕێبازی ڕۆمانتیکی سۆزەکانی خودی شاعیر خۆیەتی بۆیە هەمیشە لە بارەی خودی خۆیەوە دەدوێت دەڵێی خۆی ئەو جیهانە گەورەیەیە کە هەموو شتێکی لە خۆگرتووە. ئەو دەناڵێنێت، دەگری، ئازار دەکێشێت یا دەتلێتەوە وەک ئەوەی داوا لە خوێنەر بکات بەشداری لەگەڵدا بکات. کەواتە ڕێڕەوی ئەم ڕێبازە جەخت لەسەر شاعیر دەکات کە بە ئازار و ژانەوە بتلێتەوە تا هەمان کار لە خەڵک بکات.

**٨ - گەڕانەوە بەرەو سەدە کۆنەکان:**

"سەدەکانی ناوەڕاست" کە جێگای ڕق لێبوونەوەی کلاسیکەکان بوو، ڕۆمانسییەکان بەپێچەوانەوە ڕیزیان دەگرت و خۆشیان دەویست: بە بەشێک لە کولتووری نەتەوەیی و مەسیحیانەی خۆیان لە قەڵەم دەدا و لە داهێنانی خۆیاندا زیندوویان دەکردەوە.

عەقڵخوازیی سەردەمی ڕۆشەنگەری (سەدەی ١٨م)، بە ڕادەیەک گرنگی بە دوارۆژی مرۆڤایەتی دەدا کە کار بەوە گەیشتبوو ڕابردوو بەتەواوی فەرامۆش بکریت. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بزووتنەوەیەکی فیکریی دیکە لە بەردەم ڕوشەنگەریدا قیت ببێتەوە. ئەویش بزوتنەوەی ڕۆمانسیزم بوو، کە سۆزی مرۆڤایەتی بۆ ڕابردوو، سەردەمە زێڕینییەکانی مێژووی کۆنی مرۆڤایەتی دەبزواند. ئەم بزوتنەوەیە سەرەتا لە ئەڵمانیادا سەری هەڵدا، دواتر بۆ هەموو

ئەورووپا پەلوپۆی هاویشت. هۆی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم لە ئەڵمانیادا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چونکە ئەڵمانیای ئەو سەردەم، واتە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا، لە ڕووی سیاسییەوە ببووە دەوڵەتێکی لاواز و پارچە پارچەکراو. جا لەبەرئەوە جێگای سەرسوڕمان نەبوو ئەگەر کەسانێک هەبووبن سۆزیان بۆ ئەو ڕۆژانە بجوولێت کە ئەڵمانیا دەوڵەتێکی بەهێز و دەسەڵاتدار بوو.

سەردەمی ڕۆمانسییەت لە هەمان کاتدا سەردەمی ڕسکانی ناسیونالیزم بوو لە ئەورووپا بۆیە دەستیان کردە گەڕانەوە بەرەو ئەدەبە نەتەوەیی و فۆلکلۆرەکانیان. هەر بۆیە ئەفسانە و هەڵبەستە میللییەکانی ئەسکەندەنافییەکان لە ساڵی ١٧٥٦دا بەباشی هاتنە ناساندن. لە ئەڵمانیاش ئەدەبیاتی سەدەکانی ناوەڕاست بووە جێی سەرنجدان و لێ وردبوونەوە. لە ئیسپانیا گۆرانییە میللییە کۆنەکان. بەرهەمەکانی شکسپیر، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا، ڕەونەق و ڕەواجێکی زۆریان پەیداکرد، لە ئیتالیاش دانتی تازەبووەوە. هەروەها ئەدەبیاتی ئینگلیزیش لەم بوارەدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا. لە فەرەنساش شیعرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست زیندووکرانەوە.

بەم شێوەیە سەدەکانی ناوەڕاست بە ئەفسانە و چیرۆک و گۆرانییە میللییەکانی خۆیەوە و بە قەشە گوناهکارەکانی، بە سوارچاک و خەڵکە سادە و مەجلیسە مەشرەفخۆشەکانییەوە... سەرنجی ڕۆمانتیکەکانی ڕاکێشا. هووگۆ، هان دیزلاند Han d Islande و بالادەکان Ballades ی نووسی و نۆتردامی پاریس کە بەهێزترین بەرهەمی ئەوە بە شێوازی گووتێکی سەدەکانی ناوەڕاست هاتبووە نووسین.

### ٩- ئەفسوونی پەیڤ:

لای ڕۆمانسییەکان، فراژوویی شیعر لە زمانە وێنەدارییەکەیدایە نەک لە تەقریریەتە عەقڵییەکەیدا.

وشە تەنیا ئامرازی دەربڕینێکی سادە نییە، بەڵکو خۆی لە خۆیدا خاوەن بایەخێکی گەورەیە و پێویستە لە نرخی خەیاڵخرۆشانەی ئەو وشەیە و ئاهەنگەکەی تێ بگەین. پەیوەندیی وشەکان لەگەڵ یەکتر و ئەو مانا و جۆش و خرۆشانەی کە وشە دەتوانێ بیانخولقێنی لای ڕۆمانسییەکان شتێکی زۆر گرنگە. ڤیکتۆر هووگۆ لە ١٨٣٠دا لە وتارێکدا نووسی: "وشە بریتیە لە پەیڤ و پەیڤیش خودایە".

بەم شێوەیە، بایەخدان بە وشە و پەیڤی جۆراوجۆر قامووسی ڕۆمانتیکی دەوڵەمەندتر کرد. ئەمە لە کاتێکدا کلاسیکەکان ئیکتیفایان دەکرد بە وشەی سادە و دەستنیشانکراو.

کلاسیکەکان دەیانگوت کە شیعر بریتییە لە هونەری هۆنینەوە، کە مەرجیش نییە هەموو هۆنینەوەیەک شیعر بێت. ئەمە لە کاتێکدا گەلێک پەخشان لە ناواخندا شیعرن.

کلاسیکەکان، ئیقاع لە شیعرەکانیاندا بە چاوی مۆسیقا تەماشا نەدەکرا، بەڵکو زیاتر وەک بەحرێکی عەرووزی وابوو Meter، واتە شێوەیەکی دەرەکیی ڕێکوپێکی وشەکان، شێوەیەکی پلاستیکیانەی ئەوتۆ کە زەمەن و وشەکانی تێدا بزرنگێنێتەوە. ڕۆمانسییەکان، بەپێچەوانەوە، هەستیان بەوە کرد بێن ترپەی دڵ و دەنگی هەناسەی هەستەکانی خۆیان بترنجێننە ناو ئیقاعەوە. هەر لێرەشەوە کەوتنە سەر دۆزینەوەی بەحری تازەی جۆراوجۆرتر و بەکارهێنانی نەزمی نوێ: هەڵبەستی سپی Blank verse. بایرۆن هەندێک جار تێکەڵەیەکی هەردووکیانی بەکاردەهێنا. هەندێ جاری دیکەش لە بەحرێکەوە بازی دەدا بۆ سەر بەحرێکی دیکە. بە هەمان شێوە ڕۆمانسییەکانی دیکەی وەک شیللی. بەم شێوەیە، ڕۆمانسییەکان شۆڕشێکی مۆسیقاییان بەرپا کرد.

شاعیری رۆمانتیکی وێنەی جوانیی سروشت لەبەر جوانییەکە خۆی، دەکێشێت. ریالیزمیش ئەو وێنەیە دەکێشێت کە هەستی پێ دەکات: بەڵام لەبەر جوانییەکەی نا، بەڵکو لەبەر هەقیقەتەکەی جا جوان بێت یاخود ناشیرین.

رۆمانسیزم ژیانی لە رێگەی وێنەوە لێک نەدەدایەوە، بەڵکو کردەوە- وێنەی دروست دەکرد.

## بەراوردی رۆمانسیسم و کلاسیسم

بەشێوەیەکی گشتی رەوتی ئەخلاقی و چێژی ئەدەبی و هونەریی رۆمانسییەکان جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ هی کلاسیکەکان هەبوو:

١- کلاسیزم عەقڵی کردبووە بنچینەی هونەر، رۆمانسیسم هەست و خەیاڵپەردازێ.

٢- کلاسیزم کەرەستە و ئیلهامی خۆی لە ئەدەبیاتی یۆنان و رۆم یان لە مێژووی کۆن وەردەگرت، رۆمانسیسم لە ئەدەبیاتی مەسیحی سەدەکانی ناوەڕاست و رێنسانس و ئەفسانە میللییەکان و شکسپیر، هەروەها تا رادەیەکیش لە ژیانی هاوچەرخ.



پەیکەرێکی **رۆمانسی**

٣- کلاسیزم پەنایان دەبردە بەر زمانی شیعری مەنزووم و یەکنەواخت کە بوالۆ بەرگریکاری بوو، رۆمانسیزم پەنایان دەبردە بەر جۆرە شیعرێک کە لە پەخشان دەچوو، هەم لە رووی ئاهەنگ و هەم لە رووی ناوەرۆکەوە وێنەیی و هەمەچەشنە بوو. لە نووسینی شانۆنامەی تراژیدیشدا کلاسیک بە شیعر، رۆمانتیک بە پەخشان بوو.

٤- کلاسیزم زیاتر ئایدیالین، واتە لە هونەردا دەیانویست تەنیا جوانی و چاکە دەربڕن، رۆمانسیزم جگە لەوە دەیانویست ناشیرینی و خراپەش بەیان بکەن. بۆیە "درامای رۆمانتیکی" پێکهاتەیەکی تێکەڵە لە گەورەیی و نزمی، غەم و شادی.

٥- كلاسیزم بایەخیان بە گشت و کۆمەڵ دەدا، بەڵام رۆمانسییەکان بایەخیان بە تاکەکەس و تاکڕەوی دەدا و لایەنە تایبەتی و دەروونییەکانی ژیانی تاکەکەسیان دەردەبڕی.

٦- بەرنامەی رۆمانسییەکان بەرنامەی زۆرانبازی و ڕەفزکردنەوەیە. بە ڕای ئەوان ئەو دەستوورانەی رەواجیان هەبوو پێشتر ڕێگر بوون لەبەردەم ئازادی و دەربڕین. بۆیە رۆمانسییەکان هەموو قانوون و دەستوورەکانی کلاسیزمیان تێکشکاند. ڤیکتۆر هووگۆ لە پێشەکیی شانۆنامەی " Hernani " وا پێناسەی رۆمانسیزم دەکا: " ئازادیخوازی لە هونەردا".

٧- کلاسیزم سنوورێکی دیاریکراویان بۆ سروشت دانابوو و لایەنە خراپەکانی سروشت و سروشتی مرۆڤایەتییان باس نەدەکرد، بەڵام رۆمانسییەکان سروشتیان بەشێوەیەکی ئازاد باس دەکرد: بەو شێوە کێوییەی خۆی کە هەبوو، بە باشی و خراپەی خۆیەوە.

٨- کلاسیکەکان بایەخێکی ئەوتۆیان بە ڕۆمان نەدەدا، بەڵام رۆمانسییەکان ڕۆمانیان بووژاندەوە و بایەخێکی زۆریان بە نووسینی دەدا. هەر لە سەردەمی رۆمانسییەکانیشدا بوو کە ڕۆمانی شەخسی Roman personnel و ڕۆمانی مێژوویی و ڕۆمانی عەشق و ڕۆمانی دەروونی سەریان هەڵدا.

٩- کلاسیزم لایەنگیری ڕوونی و حەددییەت و ئاشکرایی لە دەربڕیندا بوون، رۆمانسیزم پابەندی دیمەن و هێما و ڕەنگ.

١٠ - یەکێتی کات و شوێن و ڕووداو لە شانۆنامەی کلاسیکدا هەبوو، لای رۆمانسییەکان تێک شکێنرا.

١١ - شیعری لیریکی لای کلاسیکەکان هێندە بایەخی نەبوو.

١٢- لای کلاسیک ڕووی نەتەوایەتی هێندە دیار نییە، ڕوویەکی جیهانی زاڵە، بەڵام لای رۆمانسییەکان ڕەنگ و مۆرکێکی نەتەوایەتی دەردەکەوێ.

## بەراوردێکی رۆمانسیزمی کوردی و ئەوروپی

١- ئێمەی کورد لە ئەدەبیاتی رۆمانسیماندا شانۆ و ڕۆمانمان نییە، بۆیە رۆمانسیزمی کوردی نەیتوانیوە بەتەواوەتی ناشیرینی و خراپەی کۆمەڵ و تاکەکەس بەیان بکات. لایەنە خراپەکانی سروشت و سروشتی مرۆڤایەتیی باس نەکردووە.

٢- قۆناغی رۆمانسیزمی کوردی هەمان ئەو قۆناغە نییە کە رۆمانسیزمی ئەوروپیی تێدا پەیدا بووە.

٣- هەندێ لە رۆمانسییە کوردییەکان (نەوەی یەکەم: مەولەوی و بێسارانی و وەفایی و وەلی دێوانە، لە شێوە و تەکنیکدا کلاسیکن، بەڵام لە ناوەرۆکدا ڕومانسین).

٤- رۆمانسیسمی ئەوروپا ئیلهامی لە ئەدەبیاتی مەسیحی و سەدەکانی ناوەڕاست و ڕێنسانس و ئەفسانە میللییەکان وەرگرتووە، بەڵام رۆمانسیسمی کوردی سەرچاوەگەلێکی دیکەی هەیە.

تا ڕادەیەکیش رۆمانسیزمی کوردی کەوتووەتە ژێر کاریگەرێتیی رۆمانسیزمی ئەوروپی: عەبدوڵڵا گۆران بەهرەی زۆری لە شاعیرانی ئینگلیزی رۆمانسیی وەک (کیتس) و (ۆردزۆرث) و (ئۆسکار وایڵد) و (بایرۆن) وەرگرتوو.

## سەرچاوە:


Dictionnaire Encyclopedique Larousse, Paris: 1979, P. 1051

Kant: Qu est-ce que les Lumieres? in Oeuvres Philosophiques, T.2, tr. par H. Wisman, ed.Gallimard, Paris: 1985.

Mad RUDLER: Parnassiens, Symbolisme et Decadents, Messein, 1938.

Henri Lemaitre: La poesie depuis Baudlaire, Ed. Armand Colin Coll., Paris: 1965. P. 85-101

Ch. M. Des Granges: Histoire de la litterature Francaise, Ed. Hatier, Paris: 1962. P. 850-902.

Kant: Le jugement esthetique, Textes choisis, Ed. PUF., 9me ed., Paris: 1991.

Pierre DE BOISDEFFRE: Les poetes francais d aujour d hui, Ed. PUF. Paris: 1979.

George Emmanuel CLANCIER: Panorama de la poesie francaise, Ed. Seghers, Paris: 1970

Claude BONNEFOY: La poesie des origines a nos jours, Ed. Seuil, Paris: 1975.

Cazamian : Le Romantisme en France e en Angletter, in Etudes Anglaises 1937, P. 19- 35.

Vantieghem: Le Romantisme dans la litterature europeenne, Paris m 1948.

Cornell Kenneth: The Symbolist movement, New Haven, Conn: 1958.

R. BRAY: La formation de la doctrine classique en France, Paris: 1951

Fidao- Justiniani: Qu est-ce qu un classique? Paris: 1930

.Alfred De Musset: Pages choisies; Larousse; Paris 1934

La decouvert dec la terre, Bibliotheque Nationale, Paris : Mai 1979, P. V-1.

Henri DEBOIS: La Peinture chez les Orientalistes, Paris: 1983.

Francoise BERENGER: La mythe de la femme orientale chez les ecrivains francais de 1806 a 1869, : these pour le doctorat, 1988, vol. II, p. 120-170.

Alphonse de LAMARTINE: Histoire de laTurquie, Paris:1854-1855, Vol. I, P. 48.

Alphonse de LAMARTINE: Voyage en Orient, ed. Hachette, Paris:1869, Vol. I, P. 426.

Francoise BERENGER: La mythe de la femme orientale chez les ecrivains francais de 1806 a 1869, these: pour le doctorat, 1988, vol. II, p. 6.

Larousse, Dictionnaire Encyclopedique, Paris: 1979, P. 1019.

M. L. DUTRENOY: L Orient Romanesque en france, ontreal 1946, P. 39-40.:

بەرهەمەکانی زۆربەی نووسەر و شاعیر و هونەرمەندە رۆمانسییەکان، نوسخە فەرەنسییە ئۆریژینالەکانیان - ئەوانەی لێرەدا ناویان هاتووە - تەماشاکراون.

د. نوور سەلمان: دەروازەیەک بۆ لێکۆڵینەوەی شیعری سمبوولیزم لە ئەدەبی نوێدا و: نەوزاد ڕەفعەت، گ. ڕامان، ژ ٢٩. سەرچاوە عەرەبییەکە: گۆڤاری (آفاق عربیه) ژمارە (٨) ساڵی (١٩٨٣).

د. عەلی لیلە: سەردەمی ڕۆشنگەری و هاتنەئارای کۆمەڵگەی مەدەنی، گ. ڕامان، ژ ١٤ - ١٥. هەولێر: ١٩٩٧

رضا سید حسینی: مکتبهای ادبی، تهران؛ ١٩٥٧.

د. حسن هنرمندی: بنیاد شعر نو در فرانسه، طهران: ١٣٥٠.

عبدالحسین سعیدیان: دایره المعارف ادبی، تهران،١٣٦٣ی هەتاوی، ل ٤٧٧.

لوليان فروست: الرومانسية، ت: عبدالواحد لؤلؤة، بغداد ١٩٧٨

نخبه من الکتاب الانجليز: الرومانتيكيه فی الادب الانجليزی، ت: عبدالوهاب المسيری، دار شوشه للطباعه، ١٩٦٤

محمد غنیمی هلال : الرومانتيكيه، مصر، ل ١٣٦- ١٤٠

نخبة من الباحثين: موسوعة نظرية الادب، ت: د. جميل نصيف التكريتي، بغداد: ١٩٩٤.

زاراوەی ریالیزم Realisme بەپێی قامووسی لارووسی فەرەنسی، ل ١١٨٦، لە دوو وشە پێک هاتووە: Real و isme کە دەکاتە «حاڵەتی بینینی واقیع بەو شێوەی کە هەیە». لە زاراوەی رەخنەسازیشدا واتە ئەو قوتابخانە ئەدەبی و هونەرییەی کە سروشت و واقیع وەک خۆی پێشکەش دەکات، بێ ئەوەی بیکاتە نموونەیی.

وشەی ریالیزم، یەکەم جار رۆماننوسێکی فەرەنسیی پایە مامناوەندی بە ناوی شامپفلۆری Champfleury (١٨٢١-١٨٨٩) لە ساڵی ١٨٤٣ دا بەکاری هێنا، ئەمەش لە بەیاننامەیەکدا بە ناونیشانی "مانیفێستی ریالیزم" کە تێیدا دەڵێ:" سیفەتی ریالیست دەدرێتە پاڵ من".

ئنجا دوای ئەو رۆماننوسی فەرەنسی، دوورانتی، پاش ئەویش هونەرمەندی سەرکێشی فەرەنسی، کۆربێ Corbet ١٨١٩- ١٨٧٧، لە شێوەی "لە واقیعدا En realite " بەکاری هێنا کە کردبوویە دروشمی سەر دەرگای پێشانگایەکی شێوەکاریی خۆی.


BALZAC EN ROBE DE CHAMBRE.
D'après le portrait de Louis Boulanger.

**بالزاک**

لە رۆشنبیریی ئەورووپیدا ریالیزم بەسەر سێ قۆناغدا تێدەپەرێ: ریالیزمی سەردەمی رێنسانس، ریالیزمی سەردەمی رۆشنگەری، ریالیزمی رەخنەگرانەی سەدەی ١٩م.

شایانی باسە، سەرەڕای ئەوەی کە بیرکردنەوەی ریالیستانە - بە بۆچوونی هەندێ لە مژوونووسانی ئەدەب - مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی رێنسانس، بەڵام خودی رێبازی ریالیزم تەنیا لە ساڵی ١٨٤٣دا بوو کە مانیفێستێکی بۆ نووسرا و راگەیەندرا: کرایە رێبازێک بۆئەوەی نووسەر و هونەرمەندان بەپێی چەند پرەنسیپێکی فراوان لەسەری برۆن.

لە چارەگی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا، لە یەک کاتدا، رێبازی رۆمانسیبیەت دوو دوژمنی سەرسەختی لێ پەیدا بوو: ریالیزم و پەرناسەکان. هەردووکیشیان، ریالیزم و

پەرناس، لە یەک سەردەم و کاتدا پەیدا بوون: پێیان وابوو کە پێویستە دار و پەردووی «خەیاڵبازیی ساویلکانەی» ڕۆمانسییەت هەڵتەکێندرێن. بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەم دوو ڕێبازەش هەر، پەرناس و ریالیزم، دژی یەکتر بوون.

ئەم خوێندنەوە کرۆنۆلۆژیاییەی خوارەوە یەکانگیری و پەیوەندیی ڕۆمانسیزم بە ریالیزم ڕوون دەکاتەوە کە چۆن هەردووکیان پێکەوە، لە منداڵدانی سەردەمی ڕێنسانس و بەتایبەتیش لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە لە دایک بوون.

## سەرچاوە فەلسەفییەکانی ریالیزم

### پێشاندانێکی کرۆنۆلۆژی



پووشکین

ریالیزم بەردەوامبوونی ڕۆمانسیزم بوو لەڕووی بایەخدانی بە ئازادییەکانی تاکەکەس و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ واقیع. تەنانەت ئەم بەردەوامبوونە لە ئاست و بوارەکانی دیکەشدا دەبینرێت، بۆ نموونە ڕۆمانسیزمی ڕووسی خۆی لە خۆیدا شێوەیەکی ریالیزم بوو، ئەمەش بەتایبەتی لای پووشکین دەردەکەوێ.

ریالیستەکان باشتر باوەشیان بۆ ڕۆشنگەری کردەوە، بەتایبەتیش چونکە بۆچوونەکانی ڕۆمانسیەکان ڕاستەوخۆ پێچەوانەی بۆچوونەکانی ڕۆشنگەری بوون: ڕۆشنگەری ڕۆڵی تاکەکەسی بەرزکردبووەوە، بانگەشەی تاکخوازی دەکرد؛ ڕۆمانسییەکان، بەپێچەوانە، خوازیاری ئەوەبوون کە تاک لەناو کۆمەڵدا بتوێتەوە، هەروەها تاک ببێتە خزمەتکاری دەوڵەت و کەنیسە. بۆیە دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین: بە پلەی یەکەم ریالیستەکان بوون کە درەنگتر توانییان بەشێوەیەکی بنچینەیی سوود لە فەلسەفەی ڕۆشنگەری وەربگرن.

بەشێوەیەکی گشتی، سەردەمی ریالیزم سەردەمێکی ڕەخنەگرانەیە، سەردەمی دەسەلات پەیداکردنی بیری

زانستییە. نیتشە ئەو سەردەمەی خۆی ناوناوە سەردەمی " ئیرادەی بێ سنووری گەیشتن بە هوشیاری".

## سەدەی ١٥-١٦: ڕێنسانس

لەگەڵ دەسپێکردنی سەردەمی ڕێنسانس Ren-naissance لە سەدەی ١٥مدا، سەرەتایەک بۆ تاکرەوباوەڕی دەست پێدەکات. بەمەش مۆرکێکی تاکەکەسییانە وردە وردە دەنووسێتە سەر بۆچوون و ڕاستییەکان. کولتووری سەردەمی ڕێنسانس ڕێگەخۆشکەرێک بوو بۆ ئەوەی درەنگتر ریالیزم سەرهەڵبدات: چونکە ڕێنسانس مرۆڤی لەدەست لێکدانەوە ئایدیالیست و هێزە غەیبییەکان ئازاد کرد و کردی بە مرۆڤێکی دنیایی.

شکسپیر (١٥٦٤ – ١٦١٦) بۆ نموونە، بەپێچەوانەی کلاسیکەکان کۆمەڵ بە ماقووڵ نابینێ، بەڵکو زیاتر وای دەبینێ کە کۆمەڵ مرۆڤی داگیرکردووە و بچووکی کردووەتەوە. شکسپیر –لە ڕێگەی پاڵەوانی ڕێنسانسییەوە – ڕەخنە لەم تەباییە و لەم داگیرکردنەی تاکەکەس بەدەست کۆمەڵەوە دەگرێ. تاکەکەس سروشتێکی پۆزەتیڤی هەیە: دەیەوێ بەپێی پێوەرەکانی خۆی، بام تاکەکەسانەش بێت، دەوروبەری خۆی بگۆڕێت.



ئەندرێ مالرۆ

## سەدەی ١٨: ڕۆشنگەری

ئەدەبیات و فەلسەفەی سەردەمی ڕۆشنگەری L age des lumieres ، لە سەدەی ١٨دا، مرۆڤی وەک ناوەندێکی واقیع و وەک نموونەیەکی کۆمەڵگە پیشانی خەڵک دا.

جۆن لۆک ١٦٣٢– ١٧٠٤ دامەزرێنی ڕۆشنگەری لە بەریتانیا، ئەوەی سەلماند کە مرۆڤ هەر بە غەریزە بیروبۆچوون و شەڕ یان خێری لەگەڵ خۆی هەڵنەگرتووە. هەموو شتێکی گەڕاندەوە بۆ ژینگە و ئەزموونەکان:

«مرۆڤ خۆی بەرپرسی یەکەمە لە ئاسوودەبوون یان بەدبەختبوونی مرۆڤ».

بیرمەندانی سەردەمی ڕۆشنگەری، ڤۆلتێر و مۆنتسیکیۆ و ڕووسۆ لە پێناو ئەوە تێدەکۆشان کە عەقڵ لە دابونەریتەکانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و پاشایەتیی ڕەها و داپلۆسین ڕزگار بکەن.

ڕۆشنگەری، وەک کانت (١٧٢٤ - ١٨٤٠) باسی دەکات، بریتییە لە دەرچوونی مرۆڤ لەو حاڵەتە دەستەوەستانییەی کە مرۆڤ بە خۆی بەسەر خۆیدا هێنابوو. مرۆڤ نەیدەتوانی ڕاستەوخۆ عەقل بەکاربهێنێت. جا بەپێی بۆچوونی کانت ڕۆشنگەری تێپەڕاندنی مرۆڤ بوو لەو بارە دەستەوەستانییە و هەنگاوێکی گەورە بوو لە بەرزکردنەوەی دەسەڵاتی عەقڵ.

لەبەر ئەوە، سەردەمی ڕۆشەنگەری پلە و پایەی عەقڵی بە ڕادەیەک بەرزکردەوە کە عەقڵ ببووە مۆرکی ئەو سەردەم. لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا، لە میانەی کاروباری سیاسییەوە ڤۆلتێر و ڕووسۆ و مۆنتسیکیۆ داوای جۆرێک لە حکومەتیان دەکرد کە لەسەر بنەمایەکی عەقڵی بێت و لەگەڵیدا ناکۆک نەبێت؛ دوا جاریش داوای جیاکردنەوەی ئایینیان لە دەوڵەت دەکرد.

جگە لەمەش، فەیلەسووفانی ڕۆشنگەری مەسیحییەت و کڵێسایان خستە ژێر ڕەخنەیەکی توندوتیژەوە. هۆیز باوەڕی بە پێداویستیی هیچ ناوەندێک نەبوو لەنێوان مرۆڤ و خوادا. ئەوەی لا پەسەند نەبوو کە کڵێسا دادگای خواوەند بێت لەسەر زەویدا.

مۆنتستکیۆ ١٦٨٩- ١٧٥٥، فەیلەسووفی فەرەنسی، خاوەنی «ڕۆحی یاساکان» و پاشان «نامە ئێرانییەکان » لە ١٧٢١، کاریگەرترین بەرهەمی دژی سیستەمی دەسەڵاتی سەدەی هەژدەم نووسی: «ئێمە دەمانەوێت دابونەریت و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیی خۆرئاوا بەئاگا بێنین».



گی دو مۆپاسان

ڤۆلتێر ١٦٩٤- ١٧٧٨، له «نامه فەلسەفییەکان» له ١٧٧٣دا دەڵێ: «من له ڕێگەی سوودوەرگرتن له سەرچاوەی بەریتانیاوە هێرشم کردە سەر سیستەمی فەرەنسی و خاڵە لاوازەکانی و بێ دادییە فەرەنسییەکان. لێبوردنی ئاینی، ئازادیخوازی له سیاسەت و بازرگانیدا، پایەبڵندیی زانست و فەلسەفە.. له بەریتانیادا سەرنجی منیان ڕاکێشابوو».

دیڤید هیووم ١٧١١- ١٧٧٦ کۆمەڵناسی ناوداری ئینگلستان ئاسۆی بیرکردنەوەی کۆمەڵناسیيانەی نووسەر و هونەرمەندانی فراوانتر کرد.

ژان ژاک ڕووسۆ ١٧١٢- ١٧٧٨، فەیلەسووفی ڕۆشنگەری فەرەنسی، دەیگوت: مەسیحییەت سەرقاڵی کێشە ئاسمانییەکانە، گوێ بە گرفتەکانی سەرزەمین نادا و مرۆڤ بە بیرکردنەوە بە ئەو دنیا خەریک دەکات. ئەمەش مەسیحییەکان ڕادەهێنێت ببن بە کۆیلە. بۆیە، بە بۆچوونی ڕووسۆ، مەسیحییەت زیان بە نەتەوە دەگەیەنێ: چونکە ڕێگرە لە بەردەم هەموو گەشەسەندنێکی کۆمەڵگە.

له سەدەی ١٨ کێشەی هونەر، لە لای لیسینگ Leesing (١٧٢٩-١٧٨١)، کە نووسەر و ڕەخنەگر و شانۆنامەنووسێکی مەزنی ئەڵمانییە، هەروەها لای دیدرۆ ١٧١٣- ١٧٨٤ فەیلەسووفی ناوداری فەرەنسا، دیسان دەبێتەوە جیهانبینیی تاکەکەس. دنیا لەپێش چاوی تاکەکەس وردە وردە دەدۆزرێتەوە، دەبێتە ناوەندێکی دنیا.

ئادەم سمیث ١٧٢٣- ١٧٩٠ لە ڕووی ئابوورییەوە، بانگەشەی ڕژێمێکی ئابووری دەکرد کە بنەماکانی عەقڵخوازی بەڕێوەی ببات و ئازادی تاکەکەس بزوێنەری بێت.

مارکیز دوساد ١٧٤٠- ١٨١٤ بایەخی سێکس و ڕۆڵی غەریزەکانی مرۆڤی پیشاندا.

فەیلەسووفی ڕۆشنگەری ئەڵمانی، هیگڵ ١٧٧٠- ١٨٣١ کە هاوسەردەمی ڕۆمانسییەکان بوو،



ئەلکزاندەر دووماس

ڕۆمانی مێژوویی

کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو بەسەر رۆمانسییەکانەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەیویست بناغەیەکی عەقڵانی و فەلسەفی بۆ ئەو هەست و سۆزە رۆمانسییانەی ئەوان دابرێژێت. بەڵام لە هەمان کاتدا، هیگڵ هەر لەو سەردەمەوە کە گەنج بوو، دەیویست یانەیەک دروست بکات لەپێناو بڵاوکردنەوەی باوەڕە رۆشنگەرییەکانی شۆڕشی فەرەنسا بەناو قوتابییاندا.

شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩ و دامەزراندنی سیستەمی پەرلەمانتاری و بڵاوبوونەوەی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ، ئنجا لە بەریتانیا شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشەکانی ئینگلستان لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا، هەروەها لە ١٨٠٨ یاسای نەهێشتنی بازرگانیکردن بە کۆیلە لە ئینگلتەرە.. هەموو ئەمانە چۆن کاریگەرییان هەبوو بەسەر سەرهەڵدانی رۆمانسیزم، بە هەمان شێوە ئاسۆی بیری ریالیستانەشیان فراوانتر کرد.

سانت سیمۆن ١٦٧٥- ١٧٥٥ لە چارەگی یەکەمی سەدەی ١٨مدا فەلسەفەی سوودی بڵاوکردەوە و داوای ئەوەی کرد کە هەموو ئەدەبیات و هونەرێک پێویستە سوودی بۆ کۆمەڵ هەبێت و کەڵک بگەیەنێتە مرۆڤ، ئەگینا بە هونەر نازاندرێت. ئەمە وای لە نووسەر و هونەرمەندان کرد کە خاسییەت و ناواخنێکی کۆمەڵایەتییانە ببەخشنە بەرهەمەکانیان: ئاوها بنووسن کە سوود بگەیەنێتە کۆمەڵ.

لەنێوان ١٨٣٠- ١٨٤٢دا، موحازەرە فەلسەفییەکانی ئۆگۆست کۆنت A.Comte ١٧٩٨- ١٨٥٧ کە ناسراوە بە فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم Pos-itivsme الوضعیە، هانی بڵاوبوونەوەی زانستی کۆمەڵناسیی دا، کە ئەمەش کاریگەریی هەبوو بەسەر دامەزراندن و بڵاوبوونەوەی رێبازی ریالیزم.

بە هەمان شێوە، فەلسەفەی ئێرنست رینان (١٨٢٣- ١٨٩٢) لە کتێبەکەی خۆیدا (داهاتووی زانست) لە ساڵی ١٨٤٨دا، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەو



زۆلا
«بەرگریکاری ئافرەتان»
لە رۆمانەکانیدا

جیهانەی زانست بۆمانی دەدۆزێتەوە پایەدارتر و دروستترە لەچاو ئەوەی کە خەیاڵ بۆمانی دەدۆزێتەوە. بەم شێوەیە، رینان، لەگەڵ پۆزەتیڤیزم یەکیان دەگرتەوە لەوەی کە پێویستە متمانە بکەینە سەر زانست نەک خەیاڵ.

پۆزەتیڤیزم، کە میتافیزیکیای ڕەت دەکردەوە، بریتی بوو لەو ڕەوتە بیرکردنەوەیەی کە لە تۆژینەوەدا پشتی بەوە دەبەست کە لە واقیعدا لە ئارادابوو و دەخرایە ژێر ئەزموونەوە. وای دەبینی کە مەعریفە لە شارەزایی پەیداکردن و هەستپێکردن و زانستەکانەوە وەدەست دەهێنرێت. ئۆگەست کۆنت دەڵێت: پاش ئەوەی عەقڵی مرۆڤایەتی دان بەوە دەنێت کە مەحاڵە بتواندرێت چەمکە ڕەهاکان دەستگیر بکرێن، لەبەرئەوە عەقل واز لەوە دەهێنێت کە لە بنچینەی گەردوون و زانینی هۆکارەکان لەودیو دیاردەکان بکۆڵێتەوە. عەقڵ تەنیا بەوە ڕازی دەبێت یاسا سەرەکییەکان بدۆزێتەوە کە دیاردەکان بەرێوە دەبەن، ئەویش بە ڕێگای بیرکردنەوە و تێبینی کردن.



**ئۆگۆست کۆنت**
**«فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم»**

پۆزەتیڤیزم دژی هەموو بۆچوون و لێکۆڵینەوەیەکی میتافیزیکیانە بوو، تەنها گرنگی بەو دیاردانە دەدا کە لەبەردەستدا بوون و دیاردەی ماددی بوون. هۆکاری سەرەکیی بڵاوبوونەوەی پۆزەتیڤیزم بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی ڕۆڵی ئامێر؛ بە ڕادەیەک کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا ئامێر ببووە سەرەکیترین هۆکاری ژیان.

ململانێی نێوان پۆزەتیڤیزم و ڕۆمانسیزم بەدرێژایی سەدەیەک بەردەوام بوو، ململانێیەک لە نێوان دوو ڕەوتی بیرکردنەوە، یەکیان گرنگی بە ماددە و ئامێر و ژیانی ڕۆژانە دەدا، ئەوی دیکەیان گرنگی بە سۆز و دنیای ڕۆحی مرۆڤ.

لە ١٨٣٠، لە فەرەنسا، شاکارەکەی ستاندال، ڕۆمانی «سوور و ڕەش» بڵاوکرایەوە، هەروەها «شەڕی

واتەرلوو» و «راهیبەی پارما» لە ١٨٣٩دا، هەرسێکیان بە ئەڵقەیەکی گرنگ دەژمێردرێن لە پەرینەوەی رۆمانسیزم بەرەو ریالیزم.

لە ١٨٣١ بەملاوە، رۆماننووسی ئینگلیز، شارل دیکنز ١٨١٢ - ١٨٧٠ دەستی کردە بلاوکردنەوەی چیرۆک و رۆمانە ریالیستەکانی، کە تاکو ١٨٧٠ چواردە رۆمانی نووسی و (ئۆلیڤەر تویست) بریتییە لە شاکارەکەی. بنچینەی ریالیزمی دیکنز لەسەر مرۆڤایەتی و بەشەردۆستی دامەزرابوو، بەرگریی لە بێ چارە و لێ قەوماو و منداڵانی بێ چارە دەکرد.

هەروەها لە رووسیا، گۆگۆڵ ١٨٠٩ - ١٨٥٢، لە ساڵانی ١٨٣١-١٨٣٢دا یەکەمین بەرهەمە ریالیستییەکانی بلاوکردەوە. فیۆدۆر داستایۆفسکی دەیگوت: " ئێمە هەموومان لە پاڵتۆکەی گۆگۆڵەوە کەوتووینەتەوە". کەواتە بە رای ئەو سەرچاوەی ریالیزمی رووسی دەگەرێتەوە بۆ گۆگۆڵ کە ئەمرۆ رەخنەگران بە بابەگەورەی ریالیزمی رەخنەگرانە لە قەڵەمی دەدەن.



ئێمیلی و شارلووت و ئان برۆنتی

لە ساڵی ١٨٤١دا بالزاک ١٧٩٩- ١٨٥٠ «کۆمێدیای مرۆڤایەتی» بلاودەکاتەوە و لە پێشەکیی "چەند دیمەنێک لە ژیانێکی تایبەتی" دا دەنووسێ کە لە بەرهەمی رۆمانسییەکاندا " هەموو ساختمان و شێوەکانیان کۆن وپەژموردە بوونە و چیتر بە کەڵک نایەن"، پیشانی دا کە کاری رۆماننووس ئەمرۆ شتێکی دیکەیە.

لە ساڵی ١٨٤٣دا "مانیفێستی ریالیزم" لە لایەن رۆماننووسێکی فەرەنسی بە ناوی شامپفلۆری، بلاودەکرێتەوە کە تێیدا بنچینەکانی رێبازێکی تازەی روون کردبووەوە. بەم شێوەیە وشەی ریالیزم یەکەم جار شامپفلۆری بەکاری هێنا لە "مانیفێستی ریالیزم" دا.

لە ساڵانی ١٨٤٣-١٨٤٤ یەکەمین بەرهەم و نووسراوەکانی فەیلەسووفی ماتێریالیست، کارڵ مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) دەردەکەون کە لەگەڵ سەرجەم

بەرهەمــەکــانی دیکەی مــارکس کــاردەکــەنە ســەر بەرەوپێشـەوەچوونی بیـری ریالـیزم. مـارکس توانایەکی نوێی لەمەڕ تەفسیرکردن هێنایە کایەوە، توانی بنچینەی ئەوە دابنێت کـە بکرێت دەقـە کـۆنە پیـرۆزەکـان لێک بدرێنەوە و تەفسیر بکرێن.

لە ١٨٤٤ لە ڕووسـیـا، تۆرگنێف ١٨١٨ - ١٨٨٣، یەکەمین بەرهەمە ریالیستییەکانی بڵاودەکاتەوە.

لە ١٨٤٥ لە ڕووسـیـا، ڕەخنەگری ناودار، بلینسکی ١٨١١- ١٨٤٨، یەکــەمین بەرهەمــە ڕەخنەییــە ریالیستـیـەکانی بڵاودەکاتەوە و بنچینەکانی ڕەخنەی ئەدەبی ریالیزم دادەڕێژێ.

لە نێــوان سـاڵانی١٨٤٥- ١٨٥٩دا شـارڵ بۆدلێـر بۆچوونە ئێسـتـاتیکیـیـەکـانی خـۆی دەنووسـێت -Cu rieusites Esthetiques کە لە ١٨٦٨دا بڵاودەبێتەوە. ئەم بۆچوونانەی بۆدلێر، دژی رۆمانسیزم، سمبوولیستەکان و تەنانەت ریالیسـتـەکـانیش سـوودی لێ دەبیـنن بۆ پرەنسیپەکانی خۆیان.

لە سـاڵی ١٨٤٦دا نووسـەرێکی مـەزنی دیکەی دامەزرێنی ریالیزم لە ڕووسیا، فیۆدۆر داستایۆفسکی ١٨٢١ - ١٨٨١ دەست دەکـاتە بڵاوکردنەوەی ڕۆمـانە ریالیستـەکـانی: تاوان و سزا، برایانی کـارامـازۆف، ئەهریمەنەکان، گێلەپیاو..

سـاڵانی ١٨٤٨ -١٨٥٠، مـاوەی زۆرانبـازییـەکی سەختی نێوان پەرناس و ریالیزمە. ڕەتکردنەوەی دیاردە و ڕووداوەکانی "پەرناسییەکان/ هونەر لەپێناو هونەر" بوو، کە لە هەمان سەردەمی ریالیستەکاندا لە فەرەنسا بڵاوببووەوە. بۆ نموونە نیگارکێشی ریالیست، گۆستاف کــۆربێ دەیگوت: " ئامــانجی هونەر لەپێناو هونەر شتێکی بێهوودە و پووچە".

لە١٨٥٠دا هێـرمـەن مـێـرڤـیل (١٨١٩-١٨٩١): ڕۆمانی ریالیستانەی مۆبی دیک، بە زمانی ئینگلیزی بڵاودەکاتەوە.

لە ١٨٥٢دا لە ڕووســیــا، تۆڵســتــۆی ١٨٢٨ -



ئوومبێرتۆ ئیکۆ

١٩١٠، یەکەمین بەرهەمە ریالیستییەکانی بلاودەکاتەوە.

١٨٥٥

- گۆستاف کۆربێ: یەکەمین پیشانگەی شێوەکاریی ریالیستانە.

- تەرجەمەکردنی بەرهەمەکانی ئەدگار ئالان پۆ (١٨٠٩- ١٨٤٩)، لەلایەن بۆدلێرەوە بۆ فەرەنسی کە دەبێتە بنچینەک بۆ سەرهەڵدانی سمبوولیزم.

- دوای شامپفلۆری؛ رۆماننووسی فەرەنسی دوورانتی وشەی ریالیزمی بەکارهێنا. پاشان نیگارکێشی فەرەنسی، کۆربێ، وشەی ریالیزمی لە ساڵی ١٨٥٥دا لەشێوەی "لە واقیعدا" بەکاری هێنا کە کردبوویە دروشمی سەر دەرگای پێشانگایەکی شێوەکاریی خۆی.

١٨٥٦- ١٨٥٧

دوورانتی گۆڤارێکی دەردەکرد بە ناوی " ریالیزم"، لەوێدا خۆی و هاورێکانی بەتوندی هێرشیان دەکردە سەر پەرناس و رۆمانسییەکان. لە هەمان کاتیشدا پرەنسیپەکانی رێبازی ریالیزمیان روون دەکردەوە. تەنێ شەش ژمارە لەو گۆڤارە دەرچوو.

١٨٥٧

شارڵ بۆدلێر: گوڵەکانی خراپە.

١٨٥٩

چارلز داروین ١٨٠٩- ١٨٨٢ لە کتێبی (بنجی جۆرەکان) لە بواری بایۆلۆژیدا ئەوەی سەلماند کە یەکانگیرییەکی پتەو لەنێوان بوونەوەرەکانی سەر زەمیندا هەیە و مرۆڤ بەردەوامبوونی سروشت و گیانەوەرە فراژووەکانە. دوای ئەمەش داروینییە کۆمەڵایەتییەکان پەیدا بوون و کاریان کردە سەر بیری کۆمەڵناسی.

١٨٦١

واڵت ویتمان (١٨١٩-١٨٩٢): پەلکە گیاکان.



گۆرکی

١٨٦٨

فلۆبێرت ١٨٢١-١٨٨٠، لە نامەیەکیدا بۆ ژۆرژ ساند ١٨٠٤- ١٨٧٦ لە ڕۆژی ١٠ ی ٨ ی ١٨٦٨دا دەڵێ: " ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە دادپەروەری تێکەڵ بە هونەر بکەین؟ وێنەکێشان بەشێوەیەکی بێ لایەن، گەورەیی قانوون و وردیی زانست دەسەلمێنێ".

١٨٦٩- ١٨٧١

- فریدریک نیتشە (١٨٤٤-١٩٠٠): بڵاوکردنەوەی (بنچینەی تراژیدیا).

نیتشە سەرچاوەیەکی گرنگی دیکە بوو بۆ سەرهەڵدانی بیری ریالیزم. کاریگەرێتی ئەو لەسەر بیری ئەورووپیدا بەشێوەیەکی بەرچاو دەردەکەوێت بەتایبەتی لە ئەڵمانیا و فەرەنسادا، بەڵام ئەم کاریگەرێتییە لەو وڵاتانەی بە ئینگلیزی دەدوێن کەمتر بەرچاودەکەوێت.

نیتشە یەکەم کەس بووە مۆدێرنیزمی خستووەتە ژێر پرسیارەوە. هەر لەبەر ئەوەشە ڕەخنەی ئەو لە مۆدێرنیزم زۆر فراوانتر و تێکشکێن ترە لەچاو فەیلەسووفەکانی دیکە.

١٨٦٩

- ستێڤان مالارمێ (١٨٤٢- ١٨٩٨) لە ١٨٦٩: بڵاوکردنەوەی یەکەمین شیعرەکانی خۆی.

١٨٧١

- ڕامبۆ: بەلەمی مەست.

- هێربەرت سپێنسەر (١٨٢٠-١٩٠٣) بڵاوکردنەوەی (پرەنسیپە ئەوەڵییەکان).

١٨٧٣

- ڕامبۆ: وەرزێک لە دۆزەخ.

- تریستیان کۆربیێ (١٨٤٥- ١٨٧٥): خۆشەویستییە زەردەکان.

- شارڵ کرۆس (١٨٤٢- ١٨٨٨): یەکەم دیوانە شیعری خۆی.



**مارکس و ئەنگلس**

فەلسەفەی ماتیریالیزمیان دامەزراند و بووە فاکتەرێک بۆ گەشەسەندنی ریالیزم

١٨٧٤

- ڤێرلێن: هونەری شیعر.

- کـردنەوەی سـالۆن و سـتـۆدیۆی نیگارکـێـشـە ئیمپرەسیۆنیستەکان.

- ئـۆگـــــۆست ڕێنـوار (١٨٤١- ١٩٢٠) تـابـلـۆ ناودارەکانی دەکێشێ.

- ئیـدگار دیگا (١٨٣٤- ١٩١٧) تابلۆکانی کـچە سەماکەرەکان.

١٨٨٠ و ١٨٨١

گی دی مـۆپاسـان ١٨٥٠-١٨٩٣ یەکـەمین بەرهەمـە ریالیستییەکانی خۆی بڵاودەکاتەوە.

١٨٨٣

فرێدریک نیتشە: زەردەشت ئاوهای گوت. نیتشـە لە هەمان کاتدا دەبێتە پاڵپشتێکی دامەزراندنی ڕێبازی سمبوولیزم.

١٨٨٥

- نیگارکـێـشی ناودار، پۆوڵ سـێـزان (١٨٣٩- ١٩٠٦) بە تابلۆی (قوماربازەکان) شۆرەتی پەیداکرد.

١٨٨٨

- زۆلا ١٨٤٠- ١٩٠٢ لـە سـەرەتـادا چـەنـد ڕۆمـانێکی لەسەر بنچینەی ناتورالیسـتەکانی خۆیەوە نووسی، پاشان چەند نووسەرێکی گەنج، ناودارترینیان گی دی مـۆپاسـان، لە بۆچوونەکـانی ئاڵان و پەیڕەوی بنەمـاکـانی ئەویان کـرد. لە هەمـان کـاتدا لە یەکـتـر کۆدەبوونەوە و گـفـتـوگـۆیان دەکرد، تەنانەت لە ١٨٨٨ کتێبێکی هاوبەشی بەرهەمەکانیان چاپ کرد.

- ئەنتوان چیکۆف ١٨٦٠- ١٩٠٤، شانۆنامەنووس و ڕۆمـاننووس دەست دەکـاتە بڵاوکـردنەوەی بەرهەمـە ریالیستەکانی: لالۆ ڤانیا، باڵندەی دەریا، خوشکەکان، کورتە چیرۆکەکانی.

١٨٨٩

-مـۆریس مـەتەرلینگ (١٨٦٢- ١٩٤٩) یەکـەمین



فلۆبێرت
«مـەدام بۆڤاری... خۆمـم»

بەرهەمە سمبوولّییەکانی بڵاودەکاتەوە.

– نیگارکێشی سمبولّیست، پۆول گۆگان (١٨٤٨– ١٩٠٣): تابلۆی زۆرانبازیی یەعقووب لەگەلّ فریشتە.

– یەکەمین نووسراوە فەلسەفییەکانی هنری بێرگسۆن (١٨٥٩–١٩٤١) کە ڕەتکردنەوەی لۆژیک و عەقلّ بوو.

١٨٩٠

زۆلا کتێبە ناودارەکەی خۆی، ڕۆمانی ئەزموونگەری، بڵاوکردەوە و تێیدا بنەماکانی ریالیزمی سروشتخوازیی ڕوون کردەوە و ئنجا بە ڕۆمانی «ژێرمینال» ناتوورالیزم گەیشتە لووتکە.

١٨٩٠- ١٨٩٤

ماکسیم گۆرکی ١٨٦٨– ١٩٣٦، یەکەمین بەرهەمە ریالیستییەکانی بڵاودەکاتەوە.

لە کۆتایی سەدەی ١٩دا ریالیزمێکی تێکەلّ بە بەدبینی لە ئینگلستاندا سەری هەلّدا، نموونەی ئەو نووسەرانە ئەمانە بوون: ئێمێلی برۆنتی: (بەرزایییەکانی وێذرنج)؛ هنری جیێمس و Thackery.

لە ئەمریکاش ریالیزمی ئەمریکایی بە درێژەدانی ڕۆمانتیسم دەژمێردرێ: ئەدگار ئالان پۆ، والت وێتمان، ناتالی هۆثۆرن، ژاک لەندەن، تیۆدۆر درایزەر ١٨٧١– ١٩٤٥، جۆن شتاینبک، ئێرنست هەمەنگوای، ئەرسکین کالدویل، ویلیەم فۆلّکنەر، جان دۆس پاسۆس.

هەروەها لە سوێد ئۆگوست سترێندبێرگ ١٨٤٩ – ١٩١٢ (باوک، خاتوو ژوولیا، سیانەی دیمەشق)؛ لە نەرویج ئەپسن ١٨٢٨ – ١٩٠٦ "دوژمنی گەل"؛ بە دامەزرێنەرانی ریالیزم لەو وڵاتانە قەلّەم دەدرێن.



دیکنز

## سەرەتای ریالیزم

### جەنگی ریالیستەکان دژی رۆمانسیزم و پەرناس

رێبازی ریالیزم بۆ یەکەمین جار لە فەرەنسا لە ناوەراستی سەدەی ١٩مدا دەستی پێکرد. بەڵام یەکەمین دامەزرێنەرانی ریالیزم ئەو نووسەرانە نەبوون کە ئێمە ئەمرۆ دەیانناسین، بەڵکو چەند رۆماننوس و رەخنەگر و نووسەرێکی پایە مامناوەندی بوون، وەک: شامپفلۆری Champfleury، موورژێ Murger ١٨٢٢-١٨٦١، دوورانتی Duranty (سەرنووسەری گۆڤاری ریالیزم ١٨٥٦-١٨٥٧)، کە دژی رۆمانسیزم و پەرناسەکان هەڵسابوون و تەنانەت بۆ یەکەمین جار هەر یەکێک لەو نووسەرانەش بوو (شامپفلۆری Champ-fleury) کە لە ١٨٤٣ دا زاراوەی ریالیزمی بەکار هێنا.

ئەو رۆماننووس و رەخنەگرە فەرەنسییانە: Champh-leury و Duranty (سەرنووسەری گۆڤاری Realisme ٥٦- ١٨٥٧ لە فەرەنسا) بەرگرییان لە بنچینە و دەستوورەکانی ریالیزم دەکرد، پاشان وردە وردە بە هەموو فەرەنسا و بە ولاتانی دیکەی ئەورووپادا بڵاوبووەوە.

شامپفلۆری لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری ریالیزمدا دەینووسی کە نووسەرە ریالیستەکانی وەک خۆی (ماندوو بوونە هێندەی هەر گوێ لە درۆ و دەلەسەکانی رۆمانسییەکان بگرن) گاڵتەشی بەو رۆماننووسە رۆمانسییە دەکرد کە (ژیانی ئەمرۆ فەرامۆش دەکات و بەدیار لاشەکانی رابردووەوە دەگریت و سەردولکە بەسەر مێژوودا دەخوێنێتەوە).



پەیکەرێکی ریالیست

ریالیزم لە سەرەتادا (لە ماوەی سالآنی ١٨٤٨ ١٨٥٠ دا کە ماوەی زۆرانبازییەکی سەختی پەرناس و ریالیزمە) رەتکردنەوەیەکی دیاردە و رووداوەکانی "پەرناسییەکان/ هونەر لە پێناو هونەر" بوو، کە لە هەمان سەردەمی ریالیستەکاندا لە فەرەنسا بڵاوببووەوە. بۆ نموونە نیگارکێشی ریالیست، گۆستاف

کــوربێ Courbet دەیگوت: " ئامــانجی هونەر لە پێناو هونەر شتێکی بێ هوودە و پووچە". شامپفلۆری هەموو شێوە و جۆرە نووسینەکانی کە تا سەردەمی ئەو لە ئارادا بوون ڕەفـزی دەکـردنەوە، بەڵام نووسـراوەکـانی بالزاکی پەســەند دەکــرد و دەیگوت: " زانین لە پێنـاو توانین! ئەمــەیە ڕای من. توانای دەربڕینی ئەو ئاکـار و باوەڕ و دەوروبەرە کۆمـەڵایەتییـەی کـە تێدا دەژین. بەکورتی، هێنانە ئارای هونەرێکی زیندوو! ئەمەیە ئامانجی من!". لە سـاڵی ١٨٥٢ شـدا بۆچوونەکـانی خـۆی زێتـر ڕوون کردەوە و وتی کە پێویستە ڕۆماننووس پێش نووسین لە بارودخی گشتی و دەوروبەر بکۆڵێتەوە.

دوورانتی کە لە ٥٦-١٨٥٧دا گۆڤـارێکی دەردەکرد بە ناوی " ریالیـزم" لەوێدا خـۆی و هاوڕێکانی بەتوندی هێرشیان دەکردە سەر ڕۆمانسییەکان: هووگۆ و ئەلفرێد مووسی - یان بە " سێبەری دۆن ژووان" و گۆتی - یان بە " پیـرەمـێردێکی مـاندووی ساویلکە" ناوزەد دەکرد. تەحقیری شاعیرانیان دەکرد و دەیانگوت:" شاعیـرەکان قەشمەرترین خەڵکی دنیان".

گۆڤـاری " ریالیـزم" دوای پێنـج مـانگ داخـرا، بەڵام جـەنگی ریالیـزم دژی ڕۆمــانســیـزم و پەرناس کـۆتایی نەهات، تەنانـەت ســـەریش کـــەوت. دوورانـتی لە وتارێکدا بەبۆنەی داخرانی ریالیزم نووسی: («ریالیزم» مرد، بژی ریالیزم).

بایەخی ئەم چەند نووسـەرە لەوەدایە کـە بۆ یەکـەمین جار دەسـتوور و تیـۆر و یاساکانی ریالیزمیـان داڕشت، چەندین ڕۆمانی ریالیـزمانەشیـان نووسی و بڵاوکردەوە، بەڵام هیچ یەکێک لەو ڕۆمـانانە شـۆرەتی پەیدا نەکرد: تا ڕۆژی بڵاوبوونەوەی "کـۆمـێـدیای مـرۆڤـایەتی" ی بالزاک لە ساڵی ١٨٤١دا.

بڵاوبـوونەوەی "کـۆمـێـدیای مـرۆڤـایەتی" ی بالزاک ١٧٩٩ - ١٨٥٠ لە ســاڵی ١٨٤١دا، هەرچەند هیـچ تیـۆرێکی لەگـەڵ بڵاونەبووەوە، بەڵام ڕۆڵێکی گـەورەی بینی لە چەسپاندنی تەواوەتیی ریالیزمدا. لە پێشەکیی



داستایۆفسکی



کۆمیدیاکەیدا دەنووسێ دەڵێ: "لە ڕێگای لێکۆڵینەوە لە خەسڵەتە ئەخلاقییەکانەوە و لە ڕێگای هەڵبژاردنی ڕووداوە بنچینەییەکانی کۆمەڵ، لەوانەیە لە نووسینەوەی ئەو مێژووەدا سەربکەوم کە مێژوونووسەکان لێی بێ خەبەر بوونە: واتە مێژووی ئاکار و ڕەوشتی کۆمەڵ". بالزاک لە پێشەکیی "چەند دیمەنێک لە ژیانێکی تایبەتی" دا نووسی کە لە بەرهەمی ڕۆمانسییەکاندا " هەموو ساختمان و شێوەکانیان کۆن وپەژمووردە بوونە و چیتر بە کەڵک نایەن"، پیشانی دا کە کاری ڕۆماننووس ئەمڕۆ شتێکی دیکەیە.

ستاندال Stendal ١٧٨٣ - ١٨٤٢، ئەگەرچی زۆربەی ڕەخنەگران دەیبەنەوە سەر ڕێبازی ڕۆمانسیزمی ڕەخنەگرانە، بەڵام ڕۆڵێکی مەزنی بینی لە چەسپاندنی شێواز و ناوەڕوک و بیری ریالیستانە لە ڕۆمانی فەرەنسیدا. شاکارەکەی ئەو، سوور و ڕەش (١٨٣٠) هەروەها شەڕی واتەرلوو و ڕاهیبەی پارما (١٨٣٩) بە ئەڵقەیەکی گرنگ دەژمێردرێن لە پەڕینەوەی ڕۆمانسیزم بەرەو ریالیزم.

نووسەری ریالیستی فەرەنسی گۆستاف فلۆبێرت Flaubert ١٨٢١ - ١٨٨٠، کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو بەسەر بڵاوبوونەوەی ریالیزم. شاکارەکەی ئەو، مەدام بۆڤاری، بە جوانترین ڕۆمانی ریالیزم دەژمێردرێ. فلۆبێرت دەیویست هەمیشە خۆی لەودیو پاڵەوان و ڕووداوەکانی ڕۆماندا بشارێتەوە، واتە خەڵکی دیکە لە جیاتی خۆی بکاتە نموونەی پیشاندان و وردبوونەوە. وێڕای ئەوەش، فلۆبێرت هەرگیز حوکمی بەسەر تاوانباران و گوناهکارەکانی ناو ڕۆمانەکانیدا نەدەدا و تاوانباری نەدەکردن، هۆیەکانی ئەو تاوانبارییانەی دەستنیشان دەکرد و بێ لایەنانە دەیخستنە ڕوو. لە نامەیەکیدا بۆ ژۆرژ ساند لە ڕۆژی ١٠ ی ٨ ی ١٨٦٨ دا دەڵێ: "ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە دادپەروەری تێکەڵ بە هونەر بکەین؟ وێنەکێشان بەشێوەیەکی بێ

لایەن، گەورەیی قانوون و وردیی زانست دەسەلمێنێ". لە بەرهەمەکانی دیکەی: سالامبۆ، پەروەردەی سۆز. لە نووسەرانی دیکەی فەرەنسا کە ڕۆڵی مەزن و دیاریان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی ریالیزم: ئێمیل زۆلا، مووپاسان، برایانی گۆنکوور، A. Dumas...

لە ڕووسیا، ماکسیم گۆرکی ١٨٦٨ - ١٩٣٦ (دایک)، ڕەخنەگری ڕووس بیلینسکی؛ لەگەڵ ڕۆماننووسانی وەک گۆگۆڵ و داستایۆفسکی و تۆلستۆی و تورژنێف و چیکۆف و باسترناک و ئێلیا ئێهرەنبۆرگ دەورێکی زۆریان بووە لە بڵاوکردنەوەی ریالیزم. ریالیزمی ڕووسی هێندە دەوڵەمەندە کە دەکرێ بەتەواوەتی بەراورد بکرێ بە ریالیزمی فەرەنسی. شایانی باسە کە ریالیزمی ڕووسی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە: ریالیزمی سەرەتا، ریالیزمی ڕەخنەگرانە، ریالیزمی سۆسیالیستی.

لە ئینگلستان بیری زانستی بە ڕێبەرایەتیی ستیوارت میل و داروین سبنسەر بڵاوببووەوە کە لە ئەدەبیاتدا ڕەنگی دایەوە و جێگای بە سۆز و خەیاڵاتە بایرۆنییەکان لەق کرد. ریالیزمی ئینگلیزی بەشێوەیەکی ئەوتۆ نییە کە بەراوردی پێ لەگەڵ ریالیزمی فەرەنسی بکەین.

## خاسییەت و دەستوورەکانی ریالیزم

### ١ - مەوزووعییەت و کۆمەڵخوازی

ریالیزم بە بینینی مەوزووعیانە Objectivite خۆی لە ڕێبازەکانی پێشوو جودا دەکاتەوە. ئامانجی ئەوەیە کە سەرجەمی واقیع وەک خۆی بەرهەم بهێنێتەوە، واتە دەیەوێ بە چاوێکی کۆمەڵخوازی و دوور لە زاتییەت و خۆبینییەوە ژیان و ڕووداوە هاوچەرخەکان - وەک چۆن هەن - بەیان بکات. ئەمەش هەڵوێستێکە دژ بە ئایدیالیزمی کلاسیک و خەیاڵپەروەریی ڕۆمانتیکەکان.

دەربڕینی ڕاستی، لای نووسەری ریالیست بایەخێکی گرنگی هەبوو. شاعیری ڕۆمانتیک، بۆ نموونە، وێنەی جوانیی سروشت لەبەر جوانییەکە خۆی، دەکێشێت. ریالیزمیش ئەو وێنەیە دەکێشێت کە هەستی پێ دەکات: بەڵام لەبەر جوانییەکەی نا، بەڵکو لەبەر هەقیقەتەکەی، جا جوان بێت یاخود ناشیرین.

ریالیزم بە واتا فراوانەکەی ئەو خاسییەتەی هەیە کە وێنەیەکی وردبینانە و تەواو لە بارەی سروشت و کۆمەڵ و مرۆڤ لە بەرهەمە هونەری یا ئەدەبییەکەدا دەردەبڕێت، بۆ ئەمەش بە فراوانییەوە پشت بە لێکۆڵینەوەی ژیانی کت و متی ڕۆژانەی خەڵک دەبەستێت و زمانی ژیانی ئاسایی دەردەبڕێت.

ریالیزم لەسەر بنچینەی ڕووبەڕووبوونەوەی واقیع و تیشک خستنە سەر لایەنەکانی ژیان و شیکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان، چ دەروونی مرۆڤ و چ دەرەوەی مرۆڤ، هەڵچنراوە.

بەم شێوەیە لای ریالیستەکان مرۆڤ - لە چوارچێوەی جموجۆڵە کۆمەڵایەتییەکانیدا - دەبێتە مەیدانی سەرەکیی داهێنانی ریالیستەکان. بۆ نموونە کرێکاران وەک چینێکی مافخوراوی کۆمەڵ، یان هەژار و بێ دەرەتان و لێقەوماوان، یان ئافرەتانی چەوساوە و بەشخوراوی کۆمەڵ... بەشێوەیەکی فراوان لە داهێنانی ریالیستەکاندا ڕەنگیان دایەوە (لای زۆلا لە ژێرمینال، لای گۆرکی لە دایک، لای دیکنز).

بۆیەش ریالیستەکان لە هەڵبژاردنی پاڵەوان و کەسایەتییەکاندا شەخسیاتی ناسراو و ئەفسانەیی و مێژوویییان

هەڵنەدەبژارد (وەک رۆمانسییەکان)، بەڵکو گەڕانەوە بۆ خەڵکی عەوام و لەبیرکراوەکانی ناو کۆمەڵ. لە هەمان کاتدا ریالیستەکان مەجبوور نەبوون هەمیشە عیشق بکەنە بابەتی بەرهەمەکانیان، تەنانەت ئەگەر باسی عەشقیشیان بکردایە بەشێوەیەکی واقیعی و لە چوارچێوەیەکی باریکبینانی کۆمەڵایەتیدا باسیان دەکرد.

**٢ - فەرمانڕەوایەتیی بیر و بیری زانستی:**

ریالیزم بنچینەی تراژیدیا و گیروگرفتەکانی مرۆڤی لە قەدەر و جەبرییەت و ئەودیو سروشت و ڕێککەوت و لێکدانەوەی رۆمانسیانە دوور دەخستەوە، دەیگەڕاندەوە بۆ هۆکاری ماددی و ئابووری و کۆمەڵایەتی. بۆ نموونە، بنچینەی تراژیدیا لای ریالیستەکان، هەندێ جار دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی چینایەتی، هەندێ جاریش بۆ ململانێی نێوان نەوەکان، لای هەندێ نووسەریش دەگەڕێتەوە بۆ برسیەتی و هەژاری، زۆر جارانیش بۆ هۆکارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دیکە. کەچی دەبینین بنچینەی تراژیدیا لە ئەفسانەکاندا و لەلای کلاسیک و رۆمانسییەکاندا دەگەڕایەوە بۆ سروشت و قەدەر و ڕێککەوت و جەبریەت و هێزە شاراوەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤ.

گرنگی دانی نووسەری ریالیست بە هۆکارە ماددییەکان هێندە ئاشکرایە، کە زانست و زانا ئابووریناسەکان دەستخۆشی لە بەرهەمەکانیان دەکەن. ئەوەتا دەبینین ئابووریناسی ئەڵمان، فریدریک ئەنگلز لە بارەی بالزاکەوە ڕای وابوو کە " بالزاک لە ئابووریناسێک باشتر کۆمەڵی فەرەنسامان پێ نیشان دەدا".

ریالیستەکان وەسفکردنی مرۆڤ و دەوروبەر و گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکانیان لەسەر بنچینەی نیشاندانی هۆکارە ماددی و واقیعیەکان دادەڕشت. بۆیە دەبینین گرێی چیرۆک و پەرەسەندنی دراما لای ریالیستەکان لە ڕێککەوت و موعجیزە دوور دەکەوێتەوە؛ هەروەها لە وەسفکردندا وردبین و باریکبین بوون و بەشێوەیەکی فراوان وەسفی واقیع و کۆمەڵ و ژیانیان دەکرد، ئەمەش بۆئەوەی هیچ شتێک لە واقیعدا فەرامۆش نەکەن. ئەمە لە شێوازی هەموو رۆمانسییەکانی وەکو داستایۆفسکی و زۆلا و تۆڵستۆی دەردەکەوێ بەتایبەتیش لای بالزاک.

لەسەر ئەم بنچینەیەوە، هەرچی شتێکی ناواقیعیانەی کە رۆمانسییەکان تێکەڵ بە ئەدەب و هونەریان دەکرد (ئەودیو سروشت، فانتازیا، خەون، ئەفسانە، جیهانی فریشتان، جادوو و سیحر و خێو...) لای واقیعییەکان تووڕ هەڵدرایە دەرەوە.

ئەوەی کە ریالیزم لە ڕێبازەکانی پێشووی وەک کلاسیزم و رۆمانسیزم جودا دەکاتەوە ئەو باوەڕە پتەوەیە بە زانست، بۆ نموونە لای ئێمیل زۆلا، کاتێ ڕووداوەکان لەسەر بنەمایەکی زانستییانە شیتەڵ دەکاتەوە و بەڵگەبەندییان دەکات. تەنانەت زۆلا پێی وایە ریالیزم هیچی دیکە نییە لە پێکەڵپێک کردنەوەی زانست لەناو ئەدەبدا.

زۆلا لە (رۆمانی ئەزموونگەری)دا ئەرکی بابایەکی زانا و بابایەکی نووسەر وەکو یەکتر تەماشا دەکا: «ئێمەی نووسەر پێکڕا لەگەڵ زانایان کاردەکەین لە پێناو زاڵبوون بەسەر سروشتدا».

**٣ - هاوچەرخایەتی**

ریالیزم خەسڵەتێکی هاوچەرخانەی هەبوو: بەپێچەوانەی رۆمانسییەکان، لە " ئێستادا" و لە ئەمرۆدا دەژیا، واتە باسی ئەمڕۆ و دیاردە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییە هاوچەرخەکانی دەکرد. بۆیەش هەم لە ڕوخسار و هەم لە ناوەرۆکدا

سەردەمانە بوو و زوو جەماوەرێکی فراوانیان پەیدا کرد. شامپفلۆری، یەکێک لە دامەزرێنەرانی ریالیزم لە ۱۸۷۲ دا دەڵێ: "مرۆڤی ئەمرۆ، لە شارستانییەتی نوێماندا".

ریالیزم، بەپێچەوانەی کلاسیزم و رۆمانسیزم، نەدەگەڕایەوە بۆ ئەفسانە و مێژوو و رابردوو: تەماشای ئەمرۆی دەکرد و لە مرۆڤی ناو کۆمەڵگەی ئێستایی ورد دەبووەوە. لە بواری نیگارکێشاندا هونەرمەندانی فەرەنسی Daumi-er و Millet و Degas و Barbizon و Manet و هەروەها لە بەلجیکا پەیکەرتاش Constantin Meunier و لە رووسیا Repine و لە ئیتالیا Machiaioliو Signorini بە پیشاندانی واقیعی ژیانی هاوچەرخ رۆڵێکی گەورەیان بینی لە شیرین کردن و بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی ریالیزم لە هونەری نیگارکێشاندا.

کۆنستانتین کاڤافیس شاعیرێکی یۆنانییە (۱۸٦۳- ۱۹۳۳)، مێژووی میللەتەکەی خۆی، وەک ئەفسانەیەک لەناو شیعرەکانیدا تواندووەتەوە، بۆئەوەی بتوانێ مانایەکی تازە، بە شێوازێکی تازە، لەبارەی ژیان و مرۆڤی هاوچەرخەوە، دەرببڕێت. شاعیری ئینگلیزی (و.ه. ئۆدن) دانی بەوەدا ناوە کە بەدرێژایی سی ساڵ، هەمیشە لەژێر زەبری شیعرەکانی کاڤافیدا ماوەتەوە. ئەمانە چەند نموونەیەکی شیعری کاڤافین:

### نوێژ

دەریاوانێک، ناخی دەریا هەڵی لووشی
دایکەکەشی، بەبێ ئەوەی پێ بزانێ
لە مەزارگای (پاکیزە)دا، هەموو رۆژێ
بەدیار مۆمێکی داگیرساوەوە، هەڵدەترووشکێ..
لەپێناو ئەوەی کە کوڕەکەی بگەڕێتەوە؛
ئاسمانیش روون، ساف ببێتەوە.

دایک هەمیشە، گوێ بۆ ڕەشەبا ڕادەدێرێ.
لەوکاتەی بە چرپە خەریکی نوێژە:
ئەیقۆنەکە
بەخامۆشی
دڵ پڕ سوێ
گوێ هەڵدەخا
دەزانێ:
کوڕەکەی ڕۆیی؛
تازە چیتر ناگەڕێتەوە.

### ٤- پەرەپێدانی بیری ئازادی و تاکباوەڕی لەپێناو کۆمەڵدا

ماوەیەکی زۆر بوو، تەنانەت هەر لە سەردەمی رۆمانسییەکانەوە، نووسەر و هونەرمەند گەشتبوونە مافی ئەوەی

بتوانن لەبارەی کۆمەڵ و قانوونە ئەخلاقییەکان داوەری بکەن. هونەرمەند توانای خۆی و ئازادیی خۆی و ەدەست هێنابووەوە. بۆیەش مافی خۆی بوو لە هەموو شتێک تێ بگات.

بەم شێوەیە، ریالیزم بەردەوامبوونی رۆمانسیزم بوو: ئەدەبیات و هونەر هەموو کێشەیەکی ژیان، چ جوان چ ناشیرین، چ بەرز چ نزم، چ باش چ خراپی دەکردە بابەتی دەربڕین و لێکۆڵینەوەی خۆی؛ سوودی لە هەموو قۆناغ و هەموو دیمەنێکی ژیان و مرۆڤ و کۆمەڵ دەبینی بۆ پیشاندان: واتە باسکردنی ژیانی هەر دوو چینی سەرەوەش و خوارەوەش.. نەک تەنیا دەربڕینی ژیانی چینی سەرەوە.

جاران، ئەم ئازادییە نەبوو کە نووسەر بێت لە مەرگەساتی چینی خوارەوە بدوێت: چونکە ئەمە واتای ئەوەی دەگەیاند کە نووسەر و هونەرمەند هەڕەشە دەکاتە سەر بەرژەوەندییەکانی چینی باڵا و دەبێتە هۆی تێکدانی چێژی سەپاو. رۆمانسیزمیش، ڕاستییەکەی، لەوەی تێ نەپەڕاندبوو کە تەنیا ڕەخنەیەکی ئەخلاقیانە لە شەڕ بگرێت.

ئەدەبی کلاسیکەکان لە خزمەتی چینی ئەرستۆکراتیدا، رۆمانسییەکانیش لە خزمەتی چینی بۆرژوا و وردە بۆرژوادا بوون، جەماوەرێکی کەمیان هەبوو: بەڵام ریالیزم ڕژایە ناو هەموو خەڵکەوە، لە هەموو چین و توێژێکی خوارەوەی دەکۆڵییەوە.

هونەرمەندی ریالیست بەرژەوەندیی کۆمەڵ و بەتایبەتی چینی خوارەوە لە هونەردا دەچەسپێنی، ئەمەش لە گۆشەنیگایەکی تاکەکەسییانەی خۆیەوە. وەک مۆپاسان دەیگوت: «گەورەترین نووسەرەکان ئەوانەن کە ڕووانینی تایبەتی خۆیان بەسەر مرۆڤایەتیدا فەرز دەکەن».

جاران هونەرمەندی کلاسیک ئەگەر بیویستایە مرۆڤێکی وەسف بکردایە دەهات شەخسیەتێکی لە مێژوو یا لە نێو ئەفسانەیەکەوە هەڵدەبژارد. هونەرمەندی رۆمانتیک خودی خۆی لە جیاتی ئەو شەخسیەتە مێژوویی یان ئەفسانەییە هەڵدەبژارد و خۆی دەکردە نموونە. بەڵام هونەرمەندی ریالیست دەهات نموونەی کەسێکی چینی خوارەوەی کۆمەڵی لە جیاتی خۆی دادەنا، نموونەی کەسێکی کۆمەڵایەتی کە تەعبیر لە توێژێکی ستەمدیدە یان چینی چەوساوەی کۆمەڵ بکات.

بۆیە دەبینین تراژیدیا – لە شانۆنامە و چیرۆک و ڕۆماندا– ئەگەر لای کلاسیزم تراژیدیای چینی ئەرستۆکرات بێت (یۆلیۆس قەیسەر، شا لیر..)، یان ئەگەر لای رۆمانسییەکان تراژیدیای تاکەکەس بێت (ئازارەکانی ڤارتەر)، ئەوا تراژیدیا لای ریالیستەکان دەبێتە تراژیدیای چینی خوارەوەی کۆمەڵ، دەبێتە تراژیدیایەکی کۆمەڵایەتی (دایک، هەژارەکان، بەرزاییەکانی ویزبرینگ).

## ٥- ڕۆچوون بەناو دەرووندا

لای مارکس هوشیاریی درۆزنانەی بۆرژوازییەت جگە لە ئایدۆلۆژیا هیچ شتێکی دیکە نییە. زۆربەی باوەڕەکانی بۆرژوازییەت نەک هەر تەنها ڕەنگدانەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو ئەو واقیعە دەشێوێنن و پەردەی بەسەردا دەدەن، کە ئەمەش لەپێناو بەرژەوەندی چینایەتی و دەسەڵاتی یەک چینیدایە.

لای فرۆید، لە ژیانی مرۆڤدا هۆشیاری، لایەنێکی فراوانی ژیانی داگیرکردووە. بەڵام لە هەمان کاتدا بێ ئەوەی مرۆڤ خۆی بزانێت (بێ ئاگایی) هەروەها هەست و ئارەزووە خەفەکراوەکان، ژیانی بەڕێوەدەبەن. ئارەزووە سێکسییەکان گرنگترین ئەو ئارەزووە خەفەکراوانەی مرۆڤن لای فرۆید، کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان

لە سەر مرۆڤ هەیە، بگرە سەرتاپای ژیانی هۆشیارانەی مرۆڤیش هەڵدەسووڕێنن.

بەم جۆرە لای فرۆید هوشیاری ئاگایی- نەک هەر ناتوانێت بێ ئاگایی دیاری بکات، بەڵکو خۆیشی شێوەیەکە لە شێوەکانی دەرکەوتنی بێ ئاگایی، چونکە هوشیاری لە میانەی هێزە ناعەقلانییەکانی غەریزەدا شێوەی خۆی وەردەگرێت و دەردەکەوێت. لەبەرئەوە هۆشیاری تەعبیر لە حەقیقەتی خودی مرۆڤ ناکا، چونکە لە بنچینەدا ئەو هۆشیارییە لەسەر بنەمای خەفەکردن و لادان لە غەریزە و هێزە شاراوەکانی دیکەی خودی بێ ئاگایی دامەزراوە.

مارکس و نیتشە و فرۆید بۆ یەکەم جار ئەوەیان دۆزییەوە کە شتێک بە نێوی هۆشیاریی درۆزنانە لە ئارادا هەیە: ئەمەش چونکە هۆشیاری نەک هەر دەتوانێ ڕەنگدانەوەی حەقیقەت نەبێت، بەڵکو دەشێت پەردەیەکیش بێت حەقیقەت داپۆشێت و بیشێوێنێ. نووسەرانی ریالیزم، لە بەرهەمەکانیاندا، شێلگیرانە ئەم کارەیان ئەنجام دا کە مارکس و نیتشە و فرۆید تیۆریان بۆ دارشتبوو: نووسەر و هونەرمەندانی ریالیست پەردەیان لەسەر ئەو پەنهان و شاراوانە هەڵدایەوە.

بەم شێوەیە، لە ئەنجامی بایەخدانی نووسەرانی ریالیست بە دەروونی تاکەکەس، لە ئەنجامی ڕۆچوونی هونەرمەندانی ریالیست بەناو کانگای کۆمەڵ و تاکەکەسدا، دەبینین ئەدەبیات لە ڕووی دەروونناسییەوە – لەچاو ئەدەبیاتی ڕۆمانسییەکان – زۆر دەوڵەمەندتر دەبێت: هونەر قووڵاییەکی سۆسیۆ- سایکلۆژیی بەبڕشتتر پەیدا دەکا. هەر بۆیەش، دەروونناسی ناودار سیگمۆند فرۆید، لەبارەی توانای شیکردنەوەی دەروونی مرۆڤەوە لای ڕۆماننووسی ڕووس، فیۆدۆر داستایۆفسکی دەڵێ:"داستایۆفسکی ئەندازیاری دەرونی مرۆڤە".

نیتشە بیرمەندێک بوو، بەڕاستی تەعبیری لە جەنجاڵی و ئاڵۆزیی ئەو سەردەمە دەکرد لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کە دوواتر دەبێتە هەنگاوێکی سەرەتا بەرەو تێکشکاندنی مرۆڤ. ئەم بۆچوونە لەناو بینینی ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی ریالیستی وەک ستریندبێرگ ١٨٤٩ – ١٩١٢ و هەمەنگوای ڕەنگی دایەوە.

لە هەمان کاتدا گەڕان بەدوای پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکەس و کۆمەڵ، لای ریالیستەکان، گەیشتە ئەوەی کە ریالیزم ڕێگە خۆش بکات بۆ ئەو دەروازانەی دەچنەوە سەر پەیدابوونی ڕێبازەکانی بێهوودەیی و نێهلیزم و ناماقووڵ و سوریالیزم.

هایدگەر پوختەی ڕەخنەکانی لەسەر فەلسەفەی نیتشە، لە کتێبی (ڕێگاکانی جەنگەڵستان- ئەو ڕێگایەی ناچێت بۆ هیچ شوێنێک) خستووەتە ڕوو. هایدگەر لە میانەی ڕەخنەکانیدا نیتشە بە بیرمەندێکی میتافیزیکی دادەنێت، بەڵام هایدگەر، نیتشە لەوەدا دەبینێت کە یەکەم فەیلەسووفە هەستی بە بزووتنەوەیەکی بنچینەیی لە سەرجەم بیری ڕۆژئاوادا کردووە، ئەویش بزوتنەوەی نیهلیسمیە.

نیتشە لە میانەی ڕەخنەکانیدا خوازیاری ئەنجامدانی چاکسازییەکی ئەو شارستانییەتە بوو، ئەو شارستانییەتەی بە عەقڵ دەستی پێکردووە؛ ئەگەر مرۆڤ فریای خۆی نەکەوێ، بەدوور نازاندرێ هەر بە عەقڵیش کۆتایی بە خۆی بهێنێت.

### ٦ - فەرمانڕەوایەتیی ڕۆمان

لە هەر سەردەمێکدا یەکێک لە جۆرەکانی ئەدەب فەرمانڕەوا دەبن. سەدەی حەڤدەم سەدەی تراژیدیا و شانۆ بوو، سەدەی ١٨م سەدەی بیر و پەخشانی بیر بوو. ئەگەر درەنگتریش، سەردەمی ڕۆمانسیزم بە سەردەمی شیعر بژمێردرێت، ئەوا سەردەمی ریالیزم بە سەردەمی ڕۆمان دەژمێردرێت.

کۆتایی هاتنی رۆمانسیزم کۆتایی هاتنی ڕێژەییانەی شیعر و هێزی شاعیرانە بوو. تێوئێل گۆتییێ لە ساڵی ١٨٦٧ دا وتی : " چێژی ئەم سەردەمە ڕووی لە شیعر وەرگێڕاوە".

ریالیزم، هەم لە ڕووی چۆنیەتی و هەم لە ڕووی چەندێتییەوە، تەکانێکی گەورەی بە ڕۆمان بەخشی: ساڵانی ١٨٠٥ تا ١٨٩٠ لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوادا سەردەمی زێڕینی ڕۆمانە.

ڕەخنەگران ڕایان وایە کە تەنانەت پەرەسەندنی ریالیزم لەسەر دەستی ڕۆماننووسانی وەک بالزاک و ستانداڵ، بە هۆی ئەو کاریگەرێتییەی ڕۆمانەکانی والتەر سکۆت (١٧٧١- ١٨٣٢) بووە بەسەر بالزاک و ستانداڵدا: چونکە هەردووکیان لەژێر کاریگەرێتیی والتەر سکۆتی ڕۆمانسیدا بوونە.

ریالیستەکان دەرکیان بەوە کردبوو کە ڕۆمان ژانرێکی لە هەموو ژانرێک گونجاوترە بۆ دەربڕینی ڕووانینی هونەرمەند لەبارەی کێشە بە گرێ و گۆڵەکانی کۆمەڵگا. لەم بارەیەوە، کەواتە، دەشێ جۆرج لۆکاش ڕاست بکات کە پێی وایە ڕۆمان ژانری دڵپەسەندی سەردەمی بۆرژوایە: لۆکاش وادەبینێ کە ڕۆمان لە سەردەمی نوێدا جێگەی داستانی سەردەمی دەرەبەگایەتیی گرتووەتەوە.

## ڕێچکەکانی ڕێبازی ریالیزم

ریالیزم، بە سیفەتی ئەوەی چەند بنەمایەکی فەلسەفیش بوو و واقیعی لە ئایدیاڵ و ڕۆح جودا دەکردەوە، لە ئاکامدا بووە بنچینەیەک بۆ لەدایکبوونی چەندین لقی جۆراوجۆر.

ڕەخنەگر و ئەدەبناسان ڕێبازی ریالیزم بەسەر چەندین لق و ڕێچکەدا دابەش دەکەن (کە زۆربەی هەرە زۆریشیان لە ماوەی ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی ١٩دا ژیاون). ئەم لقانەش هەندێک بەزەحمەت یەک لە ئەوی دیکە جودا دەکرێنەوە، لەبەرئەوەی هەموویان لە یەک سەرچاوەوە هەڵقووڵاون کە ئەویش واقیعە. تەنانەت هەندێ لە ڕەخنەگران ڕێبازی پەرناس و سمبوولیزمیش دەگێڕنەوە سەر ریالیزم.

### ناتورالیزم Naturalisme

ئەم ڕێبازە ئەدبی و هونەرییە لە نێوان ساڵانی ١٨٦٠ و ١٨٨٠دا لەژێر دوو کاریگەرێتیدا دروست بوو:

١- لەژێر کاریگەرێتیی ڕێبازی ریالیزم بەتایبەتی ریالیزمی فلۆبێرت.

٢- لەژێر کاریگەرێتیی پۆزەتیڤیزمی تاین Taine کە ئەویش ڕێبازێکی فەلسەفی بوو و ئۆگۆست کۆمت Comte دایمەزراندبوو، باوەڕی بەوە هەبوو کە سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵ بەپێی چەند یاسایەکی سروشتی و ناوەوەی مرۆڤ بەڕێوە دەچن.

یەکەمین تیۆردانەر و نووسەرێک کە بنەما جوانیناسییەکانی ناتورالیزمی داڕشتبی ئێمیل زۆلا بوو، ئەویش لە کتێبی ڕۆمانی ئەزموونگەری Le Roman experimental لە ساڵی ١٨٩٠دا. ئەو، ناوەرۆک و ڕاستییەکانی ڕۆمانی لەسەر بنچینەی ئەو تێبینی و سەرنجانەوە هەڵدەچنی کە لە ڕێگای واقیع و ئەزموونەکانی سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵەوە وەدەستی دەکەوتن. باوەڕی وابوو کە ژینگە و واقیع سروشتی مرۆڤ دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

ئەم ڕێبازە دەیویست ئەدەب و هونەر بخاتە ژێر بەکارهێنانی مێتۆدەکانی زانستی پۆزەتیڤ، واتە واقیع

بەشێوەیەکی مەوزووعیانەی وردبین لە هەموو بوارێکدا بەرهەم بهێنێتەوە.

ئێمیل زۆلا ئەوەی زیادکردە سەر ریالیزم کە نووسەر پێویستە بگاتە ئاکامێک کە تەبا بێت لەگەڵ ئەنجامەکانی زانست. بەدوا یەکتر هاتنی راستییەکان دەبێ بە هەمان ئەو چەشنە بێت کە رووداوەکانی زانست پێیان دەگات. زۆلا بەپێی ئەمە لە ۳۱ چیرۆکی درێژدا مێژووی خێزانێکی فەرەنسی دەگێڕێتەوە و دەگاتە ئەو ئەنجامانەی کە زانستی بۆماوەناسی لە سەردەمەکەیدا پێیان گەیشتبوو.

چڵکنی و دزێویی جوتیار و پاڵە و کرێکارەکان، قەڵەوی و تێکسمڕاویی ژنەکانی چینی بۆرژوا کە گۆستاڤ کۆربێی ناتورالیست ۱۸۱۹- ۱۸۷۷ وێنەی دەکێشان، وەک نارەزاییەک وابوو دژی کۆمەڵی بۆرژوا.

زۆلا لە سەرەتادا چەند رۆمانێکی لەسەر بنچینەی ناتورالیستەکانی خۆیەوە نووسی، پاشان چەند نووسەرێکی گەنج، ناودارترینیان گی دی مۆپاسان، لە بۆچوونەکانی ئالان و پەیڕەوی بنەماکانی ئەویان کرد. لە هەمان کاتدا لە یەکتر کۆدەبوونەوە و گفتوگۆیان دەکرد، تەنانەت لە ۱۸۸۸ بڕیاریان دا کتێبێکی هاوبەشی بەرهەمەکانیان چاپ بکەن. لە کۆتاییدا زۆلا کتێبە ناودارەکەی خۆی، دۆمانی ئەزموونگەری، بلاوکردەوە و تێیدا بنەماکانی ناتورالیزمی روون کردەوە و ئنجا بە ژێرمینال ناتوررالیزم گەیشتە لووتکە.

تۆڵستۆی و مۆپاسان و برایانی گۆنکوور و تۆماس هاردی و ئەلکزاندەر دووماس و ئەلفۆنس دۆدێ و ئۆگۆست ستریندێرگ هەروەها پۆول ئەلێکسی، هنری ژیرارد، ئنجا هویسمان و برایان ژۆل و ئەدمۆن... لەو نووسەرانە بوون کە بە دەوری ئەم رێبازەدا کۆببوونەوە. لە بواری شانۆشدا یەکەم شانۆی ناتورالیست قەلەڕەشەکان بوو نووسراوی هـ. بێک لە ساڵی ۱۸۸۲دا.

## ریالیزمی فۆتۆگرافی

ئەم رێبازە واقیعی مرۆڤ و کۆمەڵگەی وەک چۆن خۆی هەبوو، وەک خۆی، واتە لە شێوەی وێنەیەکی فۆتۆگرافیدا دەخستە بەر چاوی خەڵک، بێ ئەوەی رەخنە لە هیچ لایەنێکی خراپی کۆمەڵ بگرێت و بێ ئەوەی نووسەر یا هونەرمەند هیچ بینینێکی تایبەتی خۆی دەرببڕێت و هیچ مۆرکێکی تایبەتی خۆی بخاتە سەر واقیعەکە.

بە رای رەخنەگرانی ئەدەب هەندێ لە بەرهەمەکانی بالزاک و تۆرژینێفی رووس دەچنەوە سەر ئەم رێبازە.

## ریالیزمی رەخنەگرانە

ئەم رێبازە واقیعی مرۆڤ و کۆمەڵگەی بەشێوەیەکی رەخنەگرانە دەخستە بەر چاوی خەڵک؛ لایەنە خراپەکانی کۆمەڵ و مرۆڤایەتیی لە چوارچێوەیەکی رەخنەییدا پێشکەش دەکرد؛ بەتایبەتی رەخنەگرتن لە چینی بالا و دەسەلاتداری کۆمەڵ و حکوومەت. لە ئاکامدا خوێنەر یا بینەری وا لێدەکرد کە بیر لە دۆزینەوەی چارەسەرێک بکاتەوە بۆ ئەو گیروگرفتانەی کە لە بەرهەمەکەدا خراونەتە روو. لە رووسیا گۆگۆڵ و هەندێ لە بەرهەمەکانی تۆڵستۆی و باسترناک و ئێلیا ئێهرەنبۆرگ سەر بەم رێبازەن. رەخنەگری رووس، رۆڵێکی دیاری هەبوو لە تیۆریزەکردنی بنەماکانی ئەم رێچکەیە.

لە ئەدەبی کوردیدا دوو چیرۆکی لە خەوماوی جەمیل سائێب و مەسەلەی وێژدانی ئەحمەد موختاربەگی جافی خۆمان سەر بەم رێبازەن.

## ریالیزمی شۆڕشگێڕانه

ئەم ڕێبـازه مـرۆڤ و كـۆمـەڵگای مـرۆڤـایەتی له حـاڵەتی پەرەسـەندن و گـۆڕانكاریدا وێنەدەكـێـشـا. بـاوەڕێكی شۆڕشگێڕانه و پتەوی بە گۆڕانی مرۆڤ و كۆمەڵگه هەبوو له خراپەوه بەرەو باش و له باشەوه بەرەو باشتر.

ئایدیـۆلۆژییـەتی مـاركـسـیـزم و لینینـیـزم، له پێش شـۆڕشی ئۆكـتـۆبەری ڕووسـیـای ١٩١٧، پاڵـپشت و زەمـینەی فیكریی ئەم ڕێبازه بوو. ناوەكەشی هەر لەمەوه هاتووه.

ماكسیم گۆركی كه هاوڕێی نزیكی لینین بوو، به دامەزرێنی ئەم ڕێبازه له قەڵەم دەدرێت. هەر ئەویش بووه مایەی پەرەسەندنی ئەم ڕێبازه و دروستبوونی ڕێبازی ریالیزمی سۆشیالیست له ساڵانی ١٩٣٢ - ١٩٣٤دا له یەكێتیی سۆڤیەت. بەناوبانگترین ڕۆمانی سەر بەم ڕێبازه: ڕۆمانی «دایك»ە، نووسراوی ماكسیم گۆركی.

## ریالیزمی سۆشیالیست

ئەم ڕێبـازه ئەدەبی و هونەرییـەیەیە كـه له سـاڵی ١٩٣٤ بەولاوه لەلایەن یەكـێـتـیی نووسـەرانی سـۆڤـیـەتییـەوه دەستنیشـان كرا و ئەركی ئەوەی گرتەبەر كه چینی كرێكاران و خەڵك به ئایدیۆلۆژییەت و ڕۆحیاتی سۆشیالیستی (كه سەرچاوەكەی یەكێتیی سۆڤیەت بوو) پەروەرده بكات.

ریالیزمی سۆشیالیست، كه "له سەرچاوەی ڕێبازه شۆڕشگێڕییه پرۆلیتارییەكانەوه هەڵدەقووڵێ" "لەسەر بناغەی بیر و ڕەوشتی سۆشیالیستی دامەزراوه".

ریالیزمی سۆشیالیست ئەم بنچینانەی هەبوو:

١- واقیعییەتێكی مەوزووعی كه له دەرەوەی هوشیاریدا هەیه و پێویسته له بەرهەمی ئەدەبیدا ڕەنگ بداتەوه.

٢- گەشبینییەكی مێژوویی له ئاستی دەربڕینی بابەت و ژیان و ڕووداوەكان پێشكەش بكات.

٣- داهێنان پێویسـته هەمـان تێگەیشـتنی زانسـتی هەبێت، واته هەمـان ئامانج بەڵام به بەكارهێنانی ئامرازێكی دیكه.

٤- ئیلتیزام كردنی نووسەر و هونەرمەندان بۆ خزمەتكردنی ئایدیالی سۆشیالیزم.

ئەم بنەمـایانه و چەندان یاسـای دیكه، ژدانۆڤ Jdanov بۆ ڕێبـازی ریالیـزمی سـۆشیـالیـسـتی دایـنـان و به درێژایی سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی ستالین، نووسەر و هونەرمـەندانی سۆڤـیـەتی خسـته نێـو چوارچێوەی تەنگی بەحزبایەتی كردنی ئەدەب و هونەرەوه.

بۆ ئەوەی سـۆشـیـالیـست بێنیـتـەوه، بەم شـێـوەیه نووسـەر ئەدەب و هونەر دەكـاته قـوربانیی ئایدیۆلۆژیەتی سۆشیالیستی. بەشێكی زۆری ڕۆمانەكانی جەنگیز ئەیتماتۆف و ڕۆمانەكانی عەرەب شەمۆ وەكو شڤانی كورد و بەربانگ سەر بەم ڕێبازەن.

## هیپێر ریالیزم Hyperralisme

زۆرتر لە بواری نیگارکێشاندا باو بوو. لە ساڵانی سییەکانی ئەم سەدەیەدا ڕاگەیەندرا لە ئەمریکا، ئەمەش لەلایەن ئێدوارد هۆپەرHopper، شارل شیلەر، ئێندریۆ وایەت Wyeth، هەروەها لەلایەن هونەرمەندان مۆنۆری Mon-ory، ژیل ئایلۆد، ۆڵفگانگ. کە شێوازێکی زۆر باریکبینانەیان هەبوو بۆ وێنەکێشانی واقیعی مرۆڤایەتی لە ئەمریکا.

## ریالیزمی تازە Nouveau Realisme

ئەم ڕێبازە کە زیاتر لە بواری هونەری نیگار و شێوەکاریدا برەوی پەیداکرد، بۆ یەکەمین جار لەلایەن سێ هونەرمەندی ئەوروپییەوە ڕاگەیەندرا (ئێڤ کلێین، ڕایمۆند هاینس، ژان تینگێلای) کە لە ساڵی **١٩٥٩** دا لە پاریس پێشانگایەکی هاوبەشیان کردەوە و کاریگەرێتییەکی گەورەیان خستە سەر هونەر لە فەرەنسا و ئەورووپادا.

ڕەواجی ئەم ڕێبازە لە ماوەی ساڵانی **١٩٦٠ - ١٩٦٣** لە ئەورووپا بەردەوام بوو؛ تا ئیتر تێکەڵ بە هونەر و ڕێباز و شێوازە هاوچەرخەکانی دیکە بوو.

هونەرمەندەکانی سەر بەم ڕێبازە واقیعی پێشکەوتووی شارستانییەتی تازەیان دەئاخنیە ناو هونەر: پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و زانستی و پیشەسازی و شارستانییەتی ئەورووپای نوی زۆر بەوردی فراوانی لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگی دەدایەوە. بۆ نموونە سوودیان لە کەلوپەل و ئامێر و کەرەستە و شتومەکی شکاو و فڕێدراو وەردەگرت بۆ دەربڕینی هونەری، یان کۆکردنەوەیان لە تابلۆیەکدا.

هەروەها چەندین ڕێچکەی دیکەی ئەمرۆیی وەک ریالیزمی سیحری (فەنتازی) و هی دیکەش.. کە هەموویان هەر سەرچاوەی خۆیان لە واقیعەوە هەڵێنجاندووە، بەڵام بۆ دەربڕین پشت بە فانتازیا و توخمەکانی ئەفسانە و زێدەڕۆیی سەیر و سەمەرە دەبەستن. گابرییل گارسیا مارکیز و ئیتالیۆ کالڤینۆ و بۆرخێس.. سەر بەم ڕێچکە تازانەی ریالیزمن.

یانیش هەندێ نووسەری ریالیستی دیکە پێیان وایە کە پێویستە مۆرکی شەخسیی خۆت بنووسێنیتە ئەو جیهانەی دروستی دەکەیت. شاعیرێکی ئەمریکایی وەک والاس ستیڤنز (**١٨٧٩-١٩٥٥**) بۆ نموونە پێی وایە: «ریالیزم بۆگەنکردنی واقیعە»، واتە تۆ پێویستە واقیع بەشێوەیەکی ئەنقەست و بە مەبەست تێک بدەیت: بۆگەن و داڕووخاو پیشانی بدەیت.

هەر چۆنێک بێت: لچک و لێوارەکانی ریالیزم ئەمرۆ فراوانتر بوونە، هەر نووسەر و هونەرمەندێک بە بینینی تایبەتی خۆی و شێوازی خۆی و تەکنیکی خۆی کاردەکات: بەدەگمەن نووسەری باشی ئاوها ماون کە خۆیان بە ڕێچکەیەکی دیاریکراو ببەستنەوە. لەم بارەیەوە، ڕووناکبیری فەرەنسی، ڕۆژێ گارۆودی، لە کتێبی (ریالیزمی بێ کەنار)دا دەڵێ کە ئەمرۆ هەرچی بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری، بە هەر شێواز و تەکنیکێک بێت.. هەر دەچێتەوە سەر ریالیزم. چونکە گارۆودی پێی وایە کە واقیع سنووری نییە و داهێنانیش ڕەنگدانەوەی واقیعە.. کەواتە: هونەرمەند هەردەم ئازادە لەوەی کە چۆن و بە چی لەو واقیعە بدوێت.

ریالیزم لە ئەدەبیاتی کوردیدا لەگەڵ سەرهەڵدانی بزاڤی ڕۆژنامەگەری (**١٨٩٨**) بڵاوەی سەند، لە ماوەی نێوان

دوو جەنگە جیهانییەکەشدا، واتە لە سالانی ١٩٢٠- ١٩٤٠دا گەیشتە لووتکەی خۆی.

گۆران بەپێچەوانەی هەموو شاعیرانی پێش سەردەمی خۆی، گەنجینەیەک بۆچوونی ریالیستانەی لەبارەی چەمکی شیعر و داهێنانەوە بۆمان جێهێشتووە. ئەم کارە تەنانەت شاعیرانی هاونەسلی خۆیشی بەدەگمەن کردوویانە. بۆ نموونە ئەم قسەیەی خوارەوەی گۆران ئەوە دەردەخات کە گۆران چەند ریالیست بووە. لەبارەی ریالیزمەوە دەڵێ:

«رۆژهەلاتییەکان چاویان بریوەتە ئاسمان، لەبەر ئەمەیە کە لە سەرەتای ژیانیان چۆن بوون هەر وەها ماونەتەوە و لە جێی خۆیانا چەقیون، پێشکەوتنیان بۆ نییە؛ بەلام رۆژئاواییەکان چونکە دەزانن هۆی ژیانیان لەسەر ئەرزە هیچ بەتەنگ ئاسمانەوە نین، چاویان بریوەتە دەوروپشتی خۆیان».

گۆران، لە ئەنجامی روانینە مۆدێرنەکەی، چەند رێبازێکی نوێی ئەدەبی دەگەڵ بەرهەمەکانی و دەنێو بەرهەمەکانیدا پەیدا دەبن: رێبازی پەرناس، رێبازی رۆمانسیزم، رێبازی ریالیزم، ریالیزمی سروشتی و رەخنەگرانە و سۆشیالیستی و شۆڕشگێری.

ریالیست بوونی گۆران لەمەدا دەردەکەوێ کە گۆران بۆ یەکەم جار کەوتە باسی جیهانی تاکەکەس و ئازادییەکانی، لە رێگەی تاکەکەسەوە هاتە ناو کێشە گشتییەکانەوە. هەروەها گۆران بابەت و کێشە و گرفتە کۆمەلایەتی و سیاسی و مرۆڤایەتییەکانی خستە بەر شیتەڵکردنەوەی روانینی خۆی. جگە لەمانەش، ناوبراو بەرەو سەرچاوە نیشتیمانی و کەلەپوورە نەتەوەییە رەسەنەکان دەگەڕێنەوە و باوەش بە سامانە شیعرییە فۆلکلۆرییەکانی خۆماندا دەکا.

لە ساڵی١٩٣٥دا گۆران رێبازی ریالیزم دەناسێت و دەست پێدەکات بەرهەمە ریالیستەکان دەخوێنێتەوە. سەرەتای کاریگەرێتیی ریالیزم بەسەر گۆران وردە وردە دەردەکەوێ. گۆران دەڵێ:

«پاش ئەم ماوەیە تەییاری سیاسی و کۆمەلایەتی کەوتە ناومانەوە وە من بە تەئسیری ئەم دوو ئەدەبەوە (ئینگلیزی و عەرەبی) کەوتمە هەوای واقیعیەتەوە..»؛ «لە ١٩٣٥ بەملاوە دوای هاتنە ناوەوەی جوولانەوەی پێشکەوتوویی (تقدمی) و کۆمەلایەتی پالی پێوە نایین کە لە ئەدەبی عەرەبی و ئینگلیزیشدا بەدوای نموونەی ئەدەبێکی (تقدمی) بگەڕێین. بەم هۆیەوە لە ١٩٣٥ بەملاوە ئەم رێگەیەم گرت (ریالیزم) وەکو لە هەڵبەستی دیاری خوای شەڕ دەردەکەوێ کە لە گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی ١٩٤٣دا بلاوکرایەوە و چەند ساڵێک بەر لەو مێژووە دامنابوو.

## سەرچاوە:

CHAMPFLEURY: Le Realisme, Paris: 1857.

Lacher WALTER: Le Realisme dans le roman contemporaine, Geneve: 1940.

Kant: Qu est-ce que les Lumieres? in Oeuvres Philosophiques, T.2, tr. par H. Wisman, ed.Gallimard, Paris: 1985.

Ch. M. Des Granges: Histoire de la litterature Francaise, Ed. Hatier, Paris: 1962. P. 850-902.

Kant: Le jugement esthetique, Textes choisis, Ed. PUF., 9me ed., Paris: 1991.

Dictionnaire Encyclopedique Larousse, Paris: 1979.

Henri Lemaitre: La poesie depuis Baudlaire, Ed. Armand Colin Coll., Paris: 1965. P. 85-101

George Emmanuel CLANCIER: Panorama de la poesie francaise, Ed. Seghers, Paris: 1970

Claude BONNEFOY: La poesie des origines a nos jours, Ed. Seuil, Paris: 1975.

Taine HYPROLYTE: Histoire de la Litterature Anglaise, Paris: 1865.

بەرهەمی بەشێک لە نووسەرە ریالیستەکان، نوسخە فەرەنسییە ئۆریژیناڵەکانیان – ئەوانەی لێرەدا ناویان هاتووە – تەماشاکراون. بە پێویستمان نەزانی ناوی سەرچاوەکانیان بنووسین.

عوسمان یاسین: نیتشە، گ. وەرگێڕان، ژ (٢)، هەولێر: ١٩٩٧.

بابک احمدی. مدرنیه واندیشەی انتقادی. نشر مرکز تهران ١٣٧٣ ص,٣٥

اي: فيليبس كريفيثنر: الفلسفة و الادب، ترجمة ابتسام عباس، بغداد: ١٩٨٩

ف. فولفین: فلسفة الانوار، ترجمة هنرييت عبودي. دار بيروت ١٩٨١ ص, ٣٧٤

دريني خشبة: اشهر المذاهب المسرحية، وزارة الثقافة والارشاد القومي، مصر: ١٩٦٢.